# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرنووسەر : مصلح مصطفی جەلالی

لەم ژمارەیەدا



ناونیشان: دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی

مەیدانی خەلانی - بەغدا - ت ٨٨٧٥٧٩٥/ ٥ خەت

الاشراف الفني / هناء صباح

# کوشتارگەی ئێران

چین :ـ

تەلەفزیۆن بینین حەرامە .... گوێگرتن لە رادیۆ بەتایبەتی رادیۆ وڵاتێکی تر حەرامە ... پیاوو ژن پێکەوە نیشکردن حەرامە ... مۆسیقاو گۆرانی حەرامە ... حەرامە .... حەرامە .... حەرامە هەموو شتێك لەم کۆمارە ئیسلامیەدا حەرامە . بەڵام ئەگەر خۆی هەندێ تلیاکی بۆکاتی خەڵوەتی لە نێو میزەرەکەیدا شاردبێتەوە رەنگبێ بە فتوای خۆی بۆ ئەو حەرام نەبێ ... ئەی بۆچی هەناسەدان بۆگەلانی ئێران بەڤەیەو حەرامە .

خوێندەواری ئازیز خومەینی بووە بە « مسیلەمە »ی دوهەم رێبازی نوێ بۆ کۆمارە شلۆقەکەی ئەیەوی یاسایەی ئیسلامیەتی خوایە تۆبە لێمان ئەگری یاسای تایبەتی بۆ خۆی دابنێ واچاکە بچێ بۆ دورگەی واق واق شورەیەك بۆ کۆمارە تایبەتیەکەی بکات یاسا تایبەتیەکەی لەوێ دابسپێنێ ئەگینا عەقڵی مرۆڤ کۆمارەکەی ئەو هەڵناگرێ .

خومەینی ئەڵێ ئەوەی گوێ رایلێم نیە لەناوی بەرن ... بگرن ... بکوژن ... بدەن لە گەردن ... منداڵو پیر ... ژنو پیاو با ( درێژەدا دری نەکەی ) ئەبێ هەموو جیهان قڕ بکرێت هەر ئەوانە بمیننەوە کە لە ژێر سایەی ڕیشە پانەکەی ئەودان .

بەڵێ ئەم هەموو روداوە سەیرانە لە کۆماری نا ئیسلامی « ئیمام » خومەینیدا روو ئەدات‌و مێژوویش لە لاپەرەیەکی رەشدا تۆمار ئەکات .

جا برایان ئێمە لەم قسەو باسانەدا مەبەستێکمان هەیە ئەڵێن ئەوانە کە فەرهەنگی رامیاری ( واتا قاموس سیاسیان ) داناوەو چەند کەسانێکی تریش ئەوانەی کە خاوەنی انسلکوپیدیاشن با چاوێك بە بەرهەمەکانی خۆیاندا بخشێنەوە بزانن خومەینی چ شتێکی بۆ کۆمارو چ « اصطلاحیکی » سیاسی تریشی هەیە بەگوێرەی فەرمودەکانی ئەو کابرا وڕێنەکەرە با « فەرهەنگەکانیان » بگۆڕن ... بەم شێوەیە ئەبێ هەموو کولیجەکان سەر لەنوێ لە کۆمارو کۆمارێتی‌و کۆماراندن ... کۆم کۆماری خومەینی بکەن .

باوکی رزگار

# ماڵئاوایی لە پێناوی مەهابادا!!

ئەمشەو بنوە !
وا لەژێر باڵی ئەمشەوە
سامناکەدا
گوێم لەناڵەی مەهابادی خۆشەویستەو ...
بانگم دەکا
ئەمشەو بنوە !
بانیگای چاوی بزێوت ....
ئەختێ بۆ خۆی ئارام بگرێ
چونکە گیانە ....
چاك برانــە .... ●
بەیانی زوو
لەگەڵ یەکەم تیشکی شەوسوو
جێت دەهێڵم
لەوانەیە جارێ‌تر بگەڕێمەوەو ....
لەباوەشی خۆمت بگرم
لەوانەیە ماڵئاوایی دوایم بێو ...
شەهادەی و دمی وەربگرم
ئەمشەو بنوە !
کێ دەزانێ
لەم جیهانە گەڕیدەیە
چەندان شاخی گەوەدارو ....
چەندان تولەڕێگا دەبڕم ؟
کێ دەزانێ
لەژێر کام مێچ
یا لەپاڵ کام کەڤر دەمرم ؟
ئەمشەو بنوە !
منیش بارگەم دەپێچمەوە
چونکە گیانە ....
چاك بزانــە ....
بەیانی زوو
لەگەڵ یەکەم تیشکی شەوسوو
جێت دەهێڵم
●

شیعری : رۆستەم باجەلان

# لەگێژینەی جەنگا

شیعری : گولیان گرینفیلد
وەرگێڕانی : کاروان

بەهار خاکە رووتەڵەکە ، گەرم ئەکاتەوە
خاکەکەیش ، بەگژوگیای سەوزو تۆقڵەدەرکردووی
کڕنۆش بۆ بەنگینی خۆر ئەبات‌و
لەنێو شنەبای گەرمیا ، ئەکەوێتە لەرزەلەرز .
ژیان : رەنگ‌و گەرمایی‌و رووناکی‌یەو
هەمیشە تاسەیان ئەکاتەوە .
مردوە ، ئەو کەسەی کە ناجەنگێ
زیندوە ، ئەو کەسەی لەنێو جەنگا ئەمرێت

* * *

مرۆڤی جەنگاوەر ، گەرمایی لەخۆرو
ژیان لەخاک‌و خێرایی لەباهوز ، وەرئەگرێت
تا لەتەڵە درەختەکانا ، بەرەو سەرهەڵدانێکی نوێ
رێ بکات .
لەدوائەنجامی جەنگیشا ، هەست بەحەسانەوەیەکی
مەزن‌و
بەڵێبوونەیی ئەکات .

* * *

لەگەڵ بەهەشتی درەوشاو ،
لەهاودەمی‌ی بەرزیا :
گەلاوێژو حەوتەوانەو پشدێن‌و ناوقەدی پەروین
لەگەڵ خۆیا ، هەڵئەگرێت .

* * *

درەختی چڕی جەنگەڵستان
هەریەکەیان ئەبن بەهاورازی ئەوی کەیان
لەنێو کەشی شڵێوەو تۆفا دەپەیڤێ‌و
بەرەو شێوو لاملی چیایان داژوا

* * *

بازەکان بەرۆژ هاتووچۆ ئەکەن
لە شەویشا ، کوندەپەپۆ چکۆلانەکە، بانگیان ئەکات
تا وەکو ئەم ، خێراو بەدەسەڵات بن
وەکو دوبەدەرکردنی دەنگ‌و هەتەربوونی دیدە

* * *

شالورەکە ئەچرێ : « براکەم ، براکەم
گەرتۆ دواگۆرانی خۆت ئەڵێیت
بەباشی بیڵێ ،
چونکەو دورنیە ، جارێکی‌تر ، گۆرانی نەڵێیتەوە
گۆرانیەکەت بڵێ : براکەم ، براکەم . »

* * *

لەساتی چاوەنواڕی پڕ لەنیگەرانی‌و لەرزۆکا
بەرلەوەی گەرمەتامسینیەکە ، دەس‌پێ‌بکا ،
ئەسپەکان ، هێزێکی پاکزادەی بێ‌نیشان ئەدەن
ئـاخ! ئەی دیدە ئارامگرتوەکان
ئـاخ ! ئەی دڵە بەزاتەکان

* * *

کاتێ کەئاگرەکان ، هەڵدایسێن
هیچ شتێ لەمێشکیا نامێنێ
تەنیا ئەشئەی جەنگ نەبێت
کەباڵی پیائەکات‌و بەرچاویشی لێڵ .

* * *

لەنێو ئەو ئەشئەو لێلیەدا ،
ـ بێباکانەو لەپاڵ ئەوەش ـ کەئەزانێ :
ئەشمشێرو ئەگولله ، لەبالای ئەم بەرزتر نابن‌و
نایخەنە نێو مەترسی مەرگەوە .

* * *

رەوتی ترشقەداری جەنگ ئەوەستێت ،
مەرگ ئەنوزێتەوەو گۆرانی ئەڵێ ،
کەچی رۆژ بەهەردوو بازووی بەهێزی
لەهەمێزی ئەگرێتەو
شەویش بەنەرمەباڵەکانی ، لوولی ئەدات .

* * *

لەوەتەی هەواڵی ڕاگەیاندنی شەڕی عیراق‌و ڕژێمی ئێران کە هەڵگیرساوە ، گەلێ بۆ چوون‌و پرسیاری جیا جیا هاتوونەتە پێشەوەو کۆمەڵانی خەلك لە هەموو لاوە لە سەرنجی تێکڕایی هۆیەکانی دەستپێ‌کردنی شەڕەکە ئەتۆژنەوەو دام‌و دەزگاکانی جیهانیش بایەخێکی فراوانیان بەم لایەنە داوە ....

دەستپێ‌کردنی شەر ، هەروەکو ئاشکرایە، لە دەسەڵاتی عیراق‌دا نەبوو ، بەڵکو لە ئەنجامی هەڵویست سلبی‌یەکانی ڕژێمی ئێران ، کە لە سەر حیسابی خوێن‌و ویژدانی مرۆڤی ئێران هاتۆتە سەرتەخت‌و هەر لە سەرەتای وەرگرتنی دەسەڵات ، بەربووەگیانی گەلانی ژێر دەست لە ئێران داو بە هەموو ڕێگاو شێوازێکی بێ‌ڕەوشتانە مامەلەی لەگەل مافی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی ئەم گەلە ژێر دەستانە کرد .. لە ڕۆژەکانی یەکەمی وەرگرتنی دەسەڵات ، ڕای‌گەیاند ، کە ناسنامەی ئەو تاقمە چیەو چۆن گاڵتە بە چارەنووسی گەلانی ئێران دەکات .. تەنانەت کەوتە ئازاردانی ئەو گەلە ماف خوراوانەو لە هەموو ڕەفتارێکی مرۆڤانە خۆی داپچڕاند .. سێبارەی بۆ هەموو ئەو ئاشتی خوازانە هێنانە خوارەوە ، کە لە هەموو پارچەکانی ئێران دەنگی نارەزایی‌و ڕق‌وکینەیان بلندبۆوەو بە بازووی پۆلایین وستیان تەختی دەسەلاتدارانی ئێران تێك بشکێنن .. بەلام ڕژێمی ئێران ، بە نەزانین خۆی ، وە لەو چوارچێوەوە کە لەمانای دیموکراتیەت ناگات ، گەلێ لەو ئاشتی خوازانەی گوللە باران کردو بەندیخانەو زیندانی پێ‌پڕ کردنەوە ..

لە بەرامبەر بە گەلانی‌تر هەروا .. ئەو ڕژێمە بڕیاری ئەوەی‌دا بە تەنیا کار هەلسوڕێنی‌و بێجگە لەوەی کە بەهیچ شێوەیەك لە چەمکی پەیمانی دەولەتان‌و هاودۆستی گەلان حالی نەبوو .. کەوتە بروبیانۆ دۆزینەوەی هەمە جۆر بۆ خۆ دوور خستنەوە .. بەلام کێ دۆڕاندی ؟ ، ئەوەتا ئەمرۆ ، لە هەموو دنیادا ڕەزالەت دەسەلاتدارانی ئێران چۆن حوکم دەبەن بەڕێوەو چ فۆڕێکیان بۆ گەلانی ئێران گرتۆتەوە ... سەرەرای ئەوە ، پڕی‌دایە دەوروپشتی ... کەف‌وکوڵی نامەردانەی خۆی بە دەستدرێژی کردنە سەر عیراق دەستپێ‌کرد .. چەندەها جار هەلویستی نارەسەنی نواندو شۆڕش لە عیراق‌دا ، لەبەر هەندێ هۆی گشتی ، خۆی لێ‌ی بێ‌دەنگ کرد .. بەلام دەسەلاتدارە ترسنۆکەکان لە ئێران‌دا ، وایان زانی ، بێ‌دەنگی سەرکردایەتی شۆڕش لە عیراق‌دا ، لە ترسنۆکی دایە ، بەلام پاشە ڕۆژی شەڕەکە خۆی لە خۆی‌دا وەلامی ئەوەی دایەوە.. جەنگە کە هەلگیرسا ، ڕێوی هەلات .. بەلام شێرە بە جەرگەکان لە ڕۆلە نەبەردەکانی عیراق ، بەباوەڕی پڕ لە فیداکاری ، هاتنە پێشەوەو زیاتر لە وانەیەکی مەردانەیان پێش‌کەش بەهەموو دنیا کرد .. بەلام ڕژێمی ئێران ، لەگەل ئەو هەموو ڕاستی‌یە ، لەگەل هەلاتن‌و کوشتن‌و وێران بوونە ، هێشتا هەر لە درۆ زلەکانی خۆی نەکەوت .. هێشتا هەر دەیووت ، سوپای ئێران چەندەها دەسەوتی بەدی‌هێناوەو سوپای عیراقی



هەرەس هێناوە ! .

•

دوای ئەوە ، سەرۆکی فەرماندە ، بەوپەڕی دڵگەورەیی خۆی ، دووبارەی کردەوە ، کە ئامادەبوونی عیراق بەردەوامە بۆ وەستانی شەڕو بەرپاکردنی ئاشتی ئەمەی ووت‌و زیاتر لە جارێ ، بەڵام دیسان ، دەسەڵاتدارانی تاران ، وایان زانی ئەم هەڵوێستە لە ئەنجامی وورەبەردان‌و هەرەس هێنانە .. گوێیان بۆ ئەم هەموو راستی‌یانەش نەکردو هەر بەردەوام بوون لە نواندنی هەڵوێستی نەزانانە ، کە شتێکی سەیرە لەم چەرخی بیستەما وێنەی ئەو رژێمەو دەسەڵاتدارانی وا بێتەکایەوە ...

لەبەرئەوە ، عیراق ، دووبارە ناچاربو بە هێزێکی نوێ‌ترەوە بێتە مەیدان ، ئەویش بۆ پاراستنی کەرامەتی خۆی ، نەك دەستدرێژی کردنە سەرمافی ئەوانی‌تر ، هەر وەکو زیاتر لە جارێ ، سەرۆکی فەرماندە ووتویە ، ئێمە چاومان لە بستێکی خاکی ئێران نیەو هەر کاتێ ئاگری شەڕ کوژایەوە ، دەیگەرێنینیەوە بۆ خاوەنی خۆی ، بەمەرجێ ئەو رژێمە نەزانە دان بە مافی خۆمان بهێنێن .. بەڵام خۆیان لەمەش گێل‌کرد .. بۆ ئەوەی دووبارە رای بگەیەنن بۆ جیهان کە لە هیچ یاسایەکی راستەقینە ناگەن‌و خۆیان بە سۆپەرمانی چەرخی بیستەم بدەنە قەڵەم .. بەڵام وادیارە کارەکە بە شێوەیەکی‌تر کەوتەوە ، هەر فرۆکەی ئێرانی بو ، بوە گاڵتەپێ‌کردنی منداڵان ، هەر سەربازی ئێرانی بو ، رای‌ئەکردو لەدوای خۆی‌دا ، پاشماوەی کوژراوی جێ ئەهێشت .. بەڵام ئێران بەزەیی بەمەدا نەهاتەوە ، چونکە هیچ کاتێ خەمی ئەوەی لە بەردانەبووە کەرامەتی مرۆڤی ئەو وولاتە بپارێزێ‌و کردویە بەداردەستی تاوانە نامەردانەکەی خۆی ...

شەڕەکە هەناسەیەکی چاکی هەڵکێشاو هەر جەنگاوەری عیراقە ، سەرکەوتنی نوێ ، بەبازوو و بەباوەڕ تۆماردەکا ، هەر جەنگاوەری عیراقە ، وێنەی پاشەرۆژێکی گەش‌و .. زۆرگەش ئەنەخشێنێ‌و رۆ . . ‌ۆژ عەمامە لە سەرەکانی قوم و تاران لەبەردەم دنیا ریسوا دەکات .

کێن ئەوانەی چەپڵە بۆ ئەم رژێمە دەکووتن ؟!

عیراق ، زۆربەی دنیا لەگەڵ مافی زەوت‌کراوی دایە ، بەڵام رژێمەکەی تاران ، بێجگە لە رژێمە خۆ فرۆشەکەی ( حافز ئەسەد )ی بەدو ( قەزافی ) سەرشێت کەسی‌تر نیە بۆی بگری ... هەموو دنیاش لەم دوو رژێمە نەزانە دەگەن کە لەسەر حسابی ویژدانی گەلانی عەرەب لە سوریاو لیبیادا حوکم دەکەن .. یەکەمیان رووڕەشی مێژووەو ئەوی تریان داردەستی راستەوخۆی کۆنەپەرستی بەڵام سەرکەوتن لە باوەڕی جەنگاوەرانی ئەم وولاتە شەرەفمەندەی عیراق دەست‌پێ‌دەکات‌و گەڕانەوەی بۆ نیەو بەردەوام دەبێ لە خەباتی ڕەوای بۆ ئەوەی خۆی بەرامبەر بە مێژوو رووسپی‌بکات‌و تاران بکاتە گۆڕستانی دوژمنان .

● خسرو باپیر ●



# تاقمە درۆزنەکەی تاران و ... پاشەڕۆژی ئێران ـ

جێی سەرسوڕمانە کە لەسەدەی بیستەمدا، لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتن و گۆڕانکارییە گەورەی لە هەموو بوارەکانی سیاسەتی نێو دەولەتاندا بەدی هاتووەو زۆربەی گەلانی سەرڕووی دنیا لە سەربەستی و ئاسوودەگی دەژین ، کەچی تازە بە تازە هەندێ لە ڕژێمە کۆنپەرستان خەریکی ڕووتانەوەو چەوساندنەوەی گەلانی ژێردەستی خۆیانن و لەجیاتی سەربەستی ، بەردەوامن لە ئازاردانیان ... لەوانەش ، ڕژێمە قەرەقۆشیەکەی تارانی سەر لێشێواو ، کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەنگی گەلانی ئێران تیایدا بەرز دەبێتەوە بۆ ڕووخانی یەکجاری .... ئەمەش ، خەونێکی نزیکەو حەتمیەتی مێژوو ئەوەی دەرخستووەکە سەرکەوتنی تەواو تەنیا بۆ داوای

هەقە . کێن ئەوانەی ئەمڕۆ حوکمی تاران دەکەن و کێن ئەوانەی کە کاریان بەدەستە ؟! . ئاشکرایە کۆمەڵێ کەسانی وا ، کە پەیوەندییان نە بە سیاسەت و نە بە تێگەیشتن سیاسەتەوە هەیەو کەم و زۆر سەری لێدەرناکەن ... ئەوەتا نەزانە تر سنۆکەکان کە دەستیان بەسەر حوکمدا گرتووە بەزەییان بە وەزعی ئێراندا نایەتەوەو ڕژانی خوێنی ڕۆڵەکانیان لەلادا بووە بەشتێکی زۆر ئاسایی .. ئەی چۆن ئەم تاقمە درۆزنە ، حوکمیان گرتە دەست ؟! . گەلانی ئێران ، خەباتیان بەردەوام بو بۆ ڕوخان (( شا ))ی ڕوخاو ، ئەوەش بو بەبازووی خۆیان توانییان ئەوە بەدی بێنن ... شا ڕوخاو سەردەمەکەی بەتاریکی و کوێرەوەری و چەوسانەوە کۆتایی هات .. بەڵام گەلانی ئێران خەباتی گەورەیان بۆ ئەوەنەبوو کە تەنیا شایەکیتر ، بەڵام عەمامە لەسەر بێتە سەر تەخت و بە قسەی زل و هەڵوێست فرۆشتن بێتە جێگای شا ، بەڵکو خەبات لەپێناو سەرکەوتنی دەنگی مرۆڤی ئێران





بوو بەرامبەر بەپاش رۆژی خۆی ... بەلام ، ئەو تاقمە درۆزنە ، دوای روخانی شا ، هیچیان لەم رژێمە دەسگیرنەبو جگە لە زولمو زۆرداری .. کە ئەمرۆ بووە بە خۆزگی گەلانی ئێران ... تەنانەت نەك بەتەنیا دەنگی خنکاوە ، بەلکو لەسەربەستی نەتەوایەتیو نیشتمانی بێبەشەو گوێی بە نالەو ئازاری گەورە ئەکرێتەوەو مافی بەدەنگەوە هاتنی نیەو رژێمە درۆنەکە وای بۆنەخشاندووە ... بەلام ، ئاشکرایە ئەو گەلە ژێردەستانە بێدەنگ نابنو لە جێی لەسێدارەدانو کوشتنی رۆلە بەجەرگەکانیان گولی هیواو سەرکەوتنی پاشەرۆژ ئەروێننو ... مێژووش لە سوڕانەوەی خۆی قەتو قەت ناکەوێ .

●



# چەند بیروهزرەک لدۆر ئەڤ ڤیاوەن نەئانی

دیوانا هێژا خەلیل دهـــوکی روناهی دیتو ئەڤ بەرهەمە ژ دەستەکا رەوشەنبیریو بەلافکرنا کوردی یێ دەرکەفتیو پێکهاتیە ژ ( ٣٠ ) هۆزانا دگـــەل فەرهەنگەکێو ئەڤ هوزانـــە یێن هاتین ڤەهاندن لناڤ بەرا سالا ١٩٧٣ ــ ١٩٧٨ و هندەک ژێ هاتینە بەلافکرن ڤەوژناما هاوکاری .

برایێمە خەلیل ڤان هۆزانا دکەت دیاری بۆ ( وێ نارینێ یا کو ئەز د دەریا چاڤێت خـــودا خەندقاندیم ) دیارە عەشـــــقو ئەڤینەک دژوار ئەگەرەک مەزنێ لێ کری هەتا وەلێ کری داکـــو قەستا پەیڤو هۆزانا بکەتو کولوو کوڤانێت خۆ بێ دارێژیتو ڤەرەڤینت هەلبەت ئـەڤ چـەند سروشتییە چنکو هۆزانڤانێت مەزن ل جیهـــانێ ئەگەرێت لێ هاتینە کرنو یێت پالڤەداین داکـــو بلندبنو بسەرکەڤن د ناڤ وەلاتێ خۆدا پشـــتی شـــکەستنا دلیو بارکرنا ئەڤینێ .. و خویـایـە

سگڤان عبدالحکیم

کو ژ نافێ دیوانی بۆمە هندەك گووتنو خاڵ تێنە بەر چاڤا وەسا تێتە رویدان کو هێژا خەلیلی تەفسیری نەکریە د ئەڤینا خۆدا بەلێ نارینا وی هێلا و قەستا وارەك دیکر ..

هوزانێن برا خەلیلی تژیە ژ بێهنا وەلاتی وپر ژ خوشتڤیو دلوڤانیاوی بۆ جهێ بێ بوی ولێ مازن بوی لێ بەلێ گەلەك جارا ئەم دبینین کو نافێ هۆزانێ دگەل بابەتی ناگونجت یان نا کەفتە سەر ئێك وەك ( کاغەزەك نەبەلاڤکریا گیڤارای ) پێدڤی بۆ هەکە بەحسێ گیڤارای ژی نەکەی دڤیا لبیراتەبا تە هندەك هزراوی ئتخستبا لناف هۆزانێ دایان تە هندەك ژ ژنیاویو راوەستاوی دژی خۆین مێژو ئیمپریالزمێ ئێكسەر ئەز حێبەتی بوم دەمێ ئەز ( هەی جانامن ) دبینم سەرەتا هۆزانێیە ..

دەمێ هۆزانڤان بەرەڤانیێ ژ هەژار وفەقیرا دکەت دڤێت داخازا هۆزانڤانی ئەو نەبیت کونانو گوشتی بو هەژارا پەیدا بکەت لێ ئەز دبێژم داخازا سەربەستیێ بەرینانیە .. هەر چەند هوزانێن برا خەلیلی لێکدانەك موکم هەیەو بهێزەو دارشتنەك بەرکەفتیو جوان یێ هەی بەلی ژ لایێ بابەتی ڤەیان بیرێڤە کێمە داگوهەبدینێ کا چ دبێژیت ..

**روندکێت دەیکا کومبکەم**
**بو تیهنیا**
**گوشتێ لەشی ژێڤەبکەم**
**دانم تێشتا خر برسیا**

نزا چرا ژبیرا سەیدا خەلیل چو کو هۆزانا کێم دلی تەنگ دکەت نەمازە هەکە ئەو هۆزان دەنگ نەدانەکی پەیدابکەتو درستبکەتو هۆزانا ژ هەمی دیوانا برا خەلیلی کەتیە دلێمن براستی ( دەرەبەگ ) نزا بوچی من ئەڤ هوزانە دیت کو گەلەك بلندەو بهێزەو تژی بێهنا راستیا وەلاتێمە تێدا هەیە لێ پا خوزی ئەڤ هۆزانە درێژتربا و هەمی هۆزانێن برا خەلیلی وئەڤە ژ حەژێ کرنامنە بوی چنکو گەنجەك هۆسا نە ئەزمانێ خۆ خاندیو نە خاندنگەها خو بدویما هی ئیناییو بەهرا پتر ژ تورڤان ورەشەنبیرێت دەڤەرامە دهولێ بونو ئەم دکارین بێژین هۆزانڤانێن سەرکەفتیو بناڤ دەنگ لجیهانێ د هۆسابون .

هۆزانا سەیدا خەلیل تێکەلبو دگەل ژیارا نهو وخەمو کوڤانێت وەلاتی دگەل هندێ ئەزمانێ هوزانێ پاقژو زەلالەو رستێت ڤەهاندین قایمنو پێکڤە گرێدانە بەلێ پا هەمی هوزان داخازیو خوزی وهیڤینە .. نە بریارەك دژوارە ژدلێ هۆزانڤانی دەرکەڤیت ژبلی هۆزانا ( دەرەبەگ ) هەما ئەڤ هۆزانە بەرسینگ گرتنا هۆزانڤانی بۆهەمی رەنگێت زورداریێو کەڤنە کومەلایەتیو هۆزانڤان دەمێ دەنگێ خوبلند دکەت رێکێ نیشا خەلکێ نەزان بکەنو چاڤێتوان ڤەکەن و باشەرۆژا رەنگین لهیڤیا وانبت ..

**دەرەبەگا لسەر رویبارێ**
**گوندێ من سکر چێکرن .**
**هزرکرن**
**خر جنیك دێ ژ تێهنێ مرن**
**لێ ژبیر کرن**
**کو لدوریێت شەنگە گوندی**
**کانی دپرن**
**کانی دپرن**

قوناغێت هۆزانا نوی هاتنە ڕانان لێ ترخان کرنا سامانی نە هاتە ژ بیرکرن دڤێ دیوانێدا .. و هەر ئەڤ هۆزانە دێ مینن وەك فندو چرای روناهیێ دەتە ناڤ دلا و هیڤیا جوانو دەلال لناف هزرادا دویرنەبیت و باوەرییو دلێری ودلوڤانی هەر بێتە چاندن بلا بپەیڤا ژی بیت ..

**خو هوشیار کەین**
**زولمو ستەمکارێ راکەین**
**لمورا من دڤێت**
**گورلو رویڤیا ڕاتەڤینم**
**شێرو پلنگێت مەیدانا**
**ڤەزڤرینم کێری دیسا**
**کەوو کەڤولو تڤیرکا**
**ژمشەختبونێ ڤەگەرینم**

دەست خۆشو هیڤیدارین ئەم هەمی پێکڤە قەستا چاپێ بکەین چنکو ئەم پێدڤیێ هندێنە وکێموکورتی قەت ژ بهایێ هۆزانێ کێم نەکریەو سستنەکریە .

# گۆستابو ئەدولفۆ بیکەر

وەرگێڕانی لە ئیسپانییەوە
محمد کاکەیی

ژیانی : ژیانی گۆستابو بەوە جیادەکرایەوە کە منداڵیەتیی غەمکینو ، لاوەتی بەهیواو ، مردنێکی زووبوو . لە شاری ئیشبیلیا ساڵی ١٨٣٦ لەدایك بووو ، ساڵی ١٨٧٠ لەمەدرید کۆچی دوایی کرد . ژیانێکی کورت ئاگادارمان دەکات کە بیکەر وەك ئەستێرەیەکی رژاوی سووتاو بە ئاگری ئارەزووی بەتاسەی بەرەو جاویدانی لەم دنیایەدا تێپەڕی :

لە دەریای ئەو گومانەی کە دەیبڕم
نازانم تەنانەت بەچی بڕوابهێنم
لەگەڵ ئەوەش ، ئەم ئارەزووانە پێم دەڵێن
من لێرەدا ، لە دەروونما ، شتێکی خوایی هەڵدەگرم .

بیکەر تەمەنی لاوەتی هەتا ساڵی نۆزدە لە ئیشبیلیا بردەسەر ، لەوێ ئەدەبیاتی سەرەتایی خوێندو ، لەگەڵ براکەی نیگار فێربوو کە ناوی ( ڤالیریانۆ Valeriano ) بووو نیگارکێشێکی ناسراوبوو لە نیگارکێشەکانی سەدەی نۆزدەم . کتێبخانەی ( خانمە مانویلا مۆناهای Doūn Manuelu Monohy ) دەورێکی باڵای هەبوو لەپێگەیاندنی بیکەری شاعیر ، ئەم خانمەیە پەروەردەکردنی بیکەری خستە ئەستۆی خۆی ئەوحەلە کە بێدایكو باوكبوو . لەم کتێبخانەیەدا بیکەر ( شاتوبریان Chateubrian )و مەدام دیستتال Madame de Staél )و بایرۆن Byron )و ( موسیە Musset )و ( هۆگۆ Hugo )و ( ئەسپیرونسیدا Espronced ) ئەم خوێندنەوانەو وێژی گەشتو گەڕانەکانی لەرۆخ کەناری دۆلی گەورە دەروونی پڕکردن لە خواستو هیوا ، هەر خێرا ڕوویکردە مەدرید بەدوای هەلەشەی ئەدەبییەوە .

بیکەر ساڵی ١٨٦٤ گەیشتە مەدرید ، کەهێشتا دەرگای کراوەی چارەنووس بوو کە هەموو ئەو کەسانەی کەوایان دەزانی شایستەی لێخورینی کەشتیی پڕ لەخەوی ئەدەبین دەچنە ناویەوە . هەرئەوە بەس نیە کەمرۆ شاعیرێکی گەورە بێ ، بەڵکو پێویستە لەسەری بە شێوەیەکی گشتی بەڕواڵەتی شاعیری گەورەش خۆی بنوێنێ . ئەوەش بە بیکەرەوە دیار نەبوو بەم شێوە هۆنراوە کورتە ، ساکارە قووڵە ، نوێکەرەوەکانی بەناو شیعری درەوشاوەی بەرزی ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەمی ئیسپانیادا گوزەریان کرد ، بێئەوەی کەس هەستیان پێبکات .

ژیانی مەدرید بەلای بیکەرەوە زۆر سەخت بوو ، ساڵەکانی یەکەمی بەکڵۆلی بردەسەر هەتاکو کاری وەرگێڕانو نووسینی وتاری لەرۆژنامەیەکدا دەسگیر بوو ، هەروەها بەهاوکاریکردنی لەگەڵ نووسەری دیکە هەندێ شانۆنامەی دانا ـ کە برادەریبوون لەخۆشیو ناخۆشی بۆ ئەوەی دەرامەتەکەی پترکا . لەساڵی ١٨٥٧دا تووشی





نەخۆشی وەرەم بوو ، بەرەبەرە هەستی بە سەرەتای ئەم نەخۆشی‌یە کرد کە بەرەو مەرگی دەبات ، کەچی ئەو لەگەڵ ئەوەش گەڕایەوە سەر نووسینی شانۆنامەو کاری رۆژنامە نووسی .

گوستابو لەگەڵ برایەکەی سەفەری کرد چوونە گرنگترین شارەکانی ئیسپانیا وەك تولەتیلەو حوریاو هی‌دی بۆ لێکۆلینەوەی شوێنەوارەکانیان. پاشان لەسالی ١٨٦١ ( کاستا ئیستیبان Casta Esteban )ی هێنا کە ئافرەتێکی رۆشنبیریی ناوەنجی بوو ، نەیتوانی لەگەڵیا لەبەری بەختەوەریدا بخوات . دواساڵەکانی ژیانی کلۆلی‌و ماندوو بوون‌و قێزبوونەوە بوو ، ئەوەشی بەم وتەیە دەربڕێ .

من هەڵبەتە حەز لە ژیان دەکەم .. بەمەرجێ ژیانێکی گۆشەگیرو بەختەوەر بێ بەبێ تواناو ئارەزوومەندی تیانەبێ ... ژیانێك بێ سەغلەتی‌و بێ‌خواست ... ئاواتـەخوازم ئەکتەرێکی هیچ‌وپووچ بم لەناو گاڵتەخانەی ئینسانی‌یەتی گەورەدا ) .

دواساڵانی ژیانی بەم بارە نائومیدە ژیا ، لە پاییزی سالی ١٨٧٠دا کۆتایی هات‌و تەنیا دوو رۆژنامە « سەدە »و « رای‌نیشتمانی » بەسێ‌چوار دێر هەوالی مردنیان بلاو کردەوە . ئەوەی ئەم شاعیرە لەبیرکراو لەبابەت ئافرەتەوە گوتویەتی ، دەیتوانی لەبارەی سەدەکەشیەوە بیلێ :

پێم سەیرنیە کەمنت بیرچۆتەوە
چونکە لەخودی خۆمدا شتێکی بەنرخ هەیە
ناتوانیت
هەر هەستیشی پێ‌بکەیت .

هۆنراوەکانی :

نووسینەکانی گوستابو ئەدۆلفۆبێکەر بریتین لە یەك دیوان پێی دەگوترێ ( هۆنراوە ) ، ئەم دیوانە - وەك هەندێ دیوانی شاعیرانی دیکە - نووسینی سەرەتایی‌و ناتەواوو شپرزەی تیانیە کە رۆژێ لەرۆژان شاعیرێکی نوێ دەردەخات ، بەلکو دیوانەکەیەتی ، کە پاش مەرگی بلاوکرایەوە ، کتێبێکە پێگەیشتن‌و قوولی‌و یەکجاری پێوە دیارە ، وەهەر هۆنراوەیەك لەنێو هۆنراوەکانی تەنیا رەسەنی‌و جوانی تێدانیە ، بەلکو سۆزێکی قوول

گەرم و گوڕی یەکەی وەك پزیسکی ئاوەبا بۆ خوێنەر دەچێ . لەگەڵ ئەوەش گومانی تیایە بە بێکەر شاعیرێکی هەستیارو بەسۆزە وەك یەکەم رەخنە لەنووسینەکانیدا بۆمان دەردەخات ، چونکە لە شیعرەکانیدا نەرمونیانیەك هەیە کە لە ئاستی ئەوجیو تەنکاویو ڕووکەشیان دوور دەخاتەوە ، ئەویش نەرمو نۆلی بیروڕاو بۆچوونە ـ ئەگەرچی هەمووده‌م هەر دەرناکەون ـ وەك ئەوەی لە زمانێکی دەربڕی دەولەمەندا بەدی دەکەین ( ئەمەش هەڵبەتە لەسنووری تەسکی زمانی بێکەرە وەك ئەوەی لەگەڵ ئەنتۆنیۆ ماچادۆش وایە ) ، ئەم بیروراو بۆچوونانە وا لەشاعیرەکەمان دەکەن کە روونترین پێشینەی سیعربێ کە داماسۆ ئەلۆنسۆ بە « شیعری ڕەگوریشە هەڵکێشراو » ناوی دەبات ئەوا ( بلاس‌دی ئۆتیرۆ Blasde Otereu ) بۆنموونە پێشەوەی هۆنراوەی ژمارە (٦٢) دێنینەوە :

ئەم پەیکەرەی دارژاوە لە ئێسقانو پێست
ئەوا ماندوو بوو
لە سوورانەوەی بەسەرێکی شێت . .

بەرامبەر ئەم دێرە ڕووتانەی کە وێنەی پەیکەرێکی ئیسقانیمان بۆ دەکێشێ ، چونکە تەعبیری ( سەرێکی شێت ) لێرەدا مانای ( کەللەیە ) ، کەس هەیە بتوانێ بڵێ کە هۆنراوەکان شیعری نەرمونۆڵنو چیتر لا نیسبەتێکی زۆر لە سۆز لە هۆنراوەکانی بێکەردا هەیە بەلام هەندە ناباتەون دەبێ تا شاعیر گالتەیێکی نادیار یا نائومێدییەك لە زڵی لە جێگەی دانێ بەرادەیێ کە رەخنەگرانی تورت بین نەتوانن لە ئاکلەکەی بگەن ، مەسەلەکەیان لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو ، سۆزێکی نەخۆشیان تیادا بەدی کرد ، کەواتە هۆنراوەکان ئاوێتەیەکی قووڵە لە وێنەی بێ‌گەرد کاردەکەنە سەر چاوو دڵمان .

ڕەسەنی.هۆنراوەکان :

ڕەسەنیی هۆنراوەکانی بێکەر یەك لەوبابەتانە بوو کە دەمەتەقێو لێکۆلینەوەیەکی گەرم و گوڕی لەسەر کرا . کە بێکەر یەکەم هۆنراوەکانی بلاو کردەوە کە لە رۆژنامەو گۆڤاری جیاجیا لەسەردەمی خۆی دەرکەوتن ، هاوچەرخەکانی ناویان نا « هەنسکی ئەلمانی » ئەم ناوە گالتەپێکردنێکی دیاری تێدابوو ، ئەوە دەخاتە مێشکەوە کە شیعری بێکەر بریتی‌یە لە دزینی ئەدەبی هەرزانی هۆنراوەکانی شاعیری ئەلمانی « هەنری هاینی » هەر لەوکاتەوە تا بەر لەو سالانەی دوایی شاعیر لەلایەن زۆر لەرەخنەگرانەوە نەناسرابوو تەنیا ئەوەنەبێ کە خۆی شاعیری ئەلمانی‌یەو کراوەتە ئیسپانی .

بەلام کارتێکردنی راستەوخۆ تەنیا لەهاینی‌یەوە نەبوو ، بەلکو وەك « ولیێم هەندریکس » دەیسەلمێنێ لە شاعیرێکی دیکەوە بوو کەتاکە سەرچاوە بوو ، یاخود بەکەمی گەورەترین ئیلهامی بێکەر بوو ، کە مەبەست لە « بیرۆن »ە . لەم بوارەدا پێویستە کارتێکردنی دوو شاعیری دیکە (لامارتین la martine )و (مۆسیە Musset ) بلێن ، لەتەك هەندێ کارتێکردنی کەمەوە لەلایەن هەندێ لەهاوچەرخانی بێکەر لەشاعیرە ئیسپانی‌یەکانی وەك « خۆسێە ماریا دی‌لاریا »و « ئۆغوستۆ فیران »و ( داکارتێە ) ، بەلام ئەوەی لەم ڕووەوە سەرمان دەسورمێنێ ئەوەیە کە ڕەسەنیی بێکەر هەمووده‌م بەپاکی مایەوە سەرەڕێ هەموو ئەو کارتێکردنانەی کە دەتوانین لە شیعرەکانیدا بیاندۆزینەوە .

## بێکەرو سەردەمەکەی :

کاتێك کە بەردەوام ژیانو بەرهەمەکانی کەوتنە بەرتیشکی لێکۆلینەوەو زیاتر ماناکانی لەچوارچێوەی شیعری ئیسپانی‌دا روون بووەوە هاتەزانین . ئەو دەمەی کە کتێبی « هۆنراوەکان »ی دانا ئەو دەمە بوو کە رۆمانتیکیەتی ئیسپانی لەدواتەمەنی‌دا بوو ، ئیتر کاتێك کە شیعرە رۆمانتیکی‌یەکانی پێشوو لە هێزو لەمۆسیقادا کزبوون تەرزێکی نوێی پڕ لەسۆزێکی قوول لە شیعری ئیسپانی‌دا پەیدابوو ، زۆر شاعیر پێش بێکەر دەبینین کە سروشتەکانی شیعری ئەویان لەلا دەرۆزینەوە ئەگەرچی لەپلەی ئاشکراییشدا جیاوازن ، ئەمەش مانای وایە شیعری بێکەر لەچوارچێوەی مێژوودا لەبەرەی پێش‌خۆی دانەبڕاوە ، بەلکو سەرباری ئەمەش بێکەر زۆرجار نموونەی بەرزی شیعری عاتیفی ئیسپانیمان بەگەشترینو کاملترین مانا بۆ وێنە دەنوێنێ ، ئەو نموونانەی کە لەسێ‌یەکی یەکەمی سەدەی ١٩دا سەریان هەڵداو بەهەنگاوی لەرزیو

ملی ڕێیان گـــرت تا پاشی ۲۰سی ساڵ گەیشتە لووتکە .

**شیعری سۆزو عاتیفە :**

شیعری سۆزو عاتیفە ئەدوا تاقیردنەوەی ڕۆمانتیکی ئیسپانییە لەسەردەستی بێکەر دەگاتە پۆپـــەو بەنەمانی ئەو ئەویش ئامینێ ، بۆیـــە بەئاسانی دەتوانین کاریگەریی شیعرەکانی ئـــەو لەشیعری شاعیرانی دوایی خۆی بدۆزینەوە .

هەروەکو ( ئەنتۆنیۆ ماچادۆ )و ( خوان ڕامۆن خیمینس ) لە هەراو قەرەباڵغی قوتابخانەی نوێ ڕایان‌کردو خۆیان گەیاندە جیهانی سۆزو عاتیفەی بێکەرو ئەگـــەر نەڵێین هەموو ئـــەوا چاکترین‌و گەورەترین بەشی بەرهەمەکانی خۆیان لێ‌دەرهێنا ، بۆیـــە دەبینین ( ماچادۆ ) لەکتێبی « واڵانەکانی گیان »داو خوان ڕامۆن خیمنس لـــە هـــەموو کتێبـــەکانی قۆناغی یەکەمیدا (۱۹۰۰ - ۱۹۱٦) لەکاتی‌ی سۆزو عاتیفەی بێکەر ئاویان هەڵهێنجـا بێ‌ئەوەی ساتێکیش ڕەسەنیی گەورەی شاعیریەتی خۆیان لەدەستدابێ .

هەر بەم جۆرەش تارمایی بێکەر لەناو ئـــەو نووسراوانەدا دیارە کەپێیان دەگوترێت « نەوەی ۱۹۲۵ » ئەمەش لەباری سروش‌و دەربڕینەوە . « لەلۆنسۆ »ی ڕەخنەگرو شاعیری ئەم نەوەیـە دەڵێ : ئەو کەسەی دەیەوێ بەباشترین شـــێوە بەرهەمەکانی ئەلبەرتی لێك‌بداتەوە یـان بەشـێك لەبەرهەمەکانی لۆرکاشی بکاتەوە ئایا لەنێوان بیرو لێکدانەوەی شـــیعری شەعبی‌دا تارمایی بێکەری بەخەیاڵدا نایە ؟

ئیتر دەنگی بێکەر دەبێ بە دەنگێکی خەواڵووی پڕ لەئازار ( هەروەکو مانویل ئەلتولاو هی‌کە )یان قوڵبێ یادکردنەوەی ولات هەڵـەداتو لە ناسکیدا نوقم‌دەبێ ( هـــەروەکو لویس ســـەرنودا )یان هەڵدەلەرزی تـا لـە گەردەلوولێدا دەخولێتەوە ( هەروەکو لەشیعرەکانی ئەم دواییەی ئەلبەرتی‌و ئەلکساندەرەش‌دا دەیبینین ) هەرچۆنێك بێت ، لەئەنجامی سەرکێشیی ڕیالزمی شوول لێ‌هەڵبڕی هەندێ لەشاعیرانی نەوەی ۱۹۲۵دا شیعر لەنەوەی دوای ئـــەواندا گـەڕایەوە مەودای چاولێکەریی جیهانی شیعرەکانی بێکەر ، چ یەکسەر لەمیـــان بەرهەمەکانی ئەنتۆنیۆ ماچادۆدا لەڕۆشنایی ئەمەدا هـــەندێ شـــاعیری وەکـــو ( لیوبولد پانیرۆ )و ( بیشنتەگاوس )و خوسی لویس‌کانو )و هی‌کە ملی ئەو ڕێگە شیعرییە پڕ لە نهێنییەیان گرت کـە بێکەر ڕێچکەی شکاندو بەچرای بلیمەتیی خۆی ڕووناکی کردەوە .

کاریگەریی بێکەر لەشیعری نوێدا هەرگیز لەبیر ناچێتەوە ، چونکـــە بریتییە لەمێژوویەکی هەمیشەیی ڕەسەنی‌و داهێناوو جوانی .

ئەمەش یەکێکە لە هەڵبەستەکانی

پەڕەسیلکەی ڕەش دەگەڕێنەوە
تاکـــو لەســـەر چەخمەکانت هێلانەکانیان دروست بکەن‌و
سەرلەنوێ بـــە باڵەکانیان لەپەنجـەرەکەت بدەن‌و
بکەوێتە یاری .
بەڵام ئەو باڵندانەی لە فڕینیانا لەسەرەخۆن
تا سەرنج بدەنە جوانیت‌و بەختەوەریم‌و
ئەوانەی فێری ناومان بوون
ئەوانە ... هەرگیز ناگەڕێنەوە .
سولتانەی دارستانی چڕ دەگەڕێتەوە
تا بەسەر دیواری باخچەکەتا هەڵبگەڕێ
سەرلەنوێ دەمی ئێوارە بەو
پەڕی تەڕو پاراوی گوڵەکانی دەپشکوون .
بەڵام گوڵی پاراوی بەشەونم
کە سەرنجمان دابوە نمەکانی کە دەلەرانەوەو
وەك فرمێسکی ڕۆژ دەکەوتن
هەرگیز ناگەڕێنەوە .
وشە شلەژاوەکانی خۆشەویستی دەگەڕێنەوە
تاسەرلەنوێ ختۆکەی گوێچکەکانت بدەن
لەوانەیە زرنگانەوەکانیان
کەمێك وەنەوزە قووڵەکەی
بێدار کەنەوە .
بەڵام فریوم نادەن
کەس تۆی خۆش ناوێ
بەکپی‌و مل‌کەچی ئەژنۆکانی دادات
وەك لەسەر برگەدا عیبادەتی خوادەکا
وەك من خۆشم‌ویستی .



نووسینی
پیرسی لوبوك
وەرگێرانی : احمد محمد اسماعیل



لەو شـــتانەی دوابەدوای شـــــێوازە جۆر بە جۆرەکاندا هاتو توانی شـــێوەی رۆمان دابـهێنێ دەبێ لـــەو کتێبـانـەدا بـۆی بگەڕێین کە جیاوازی‌یان لەگەڵ کتێبەکانی تۆلســـتۆی‌دا هەیە . سەبارەت بەدیمەنی بەشـــــە گـەورەو گـ ـــتییەکانیش کە رۆمانەکەی لێ‌پێك هاتووە ، ئاشکرایە « شـەرو ئاشـــتی » لـــە یەکێکی‌تری سـەرکەوتووترە .

**بەڵام ئەگەر مەبەســـتمان چاودێری‌کردنو بە دووکەوتنی پێنووسی رۆمان نووســـــەکە بێ لە کاتی نووسیندا ، دەبێ بەدوای شــــتێکی لەمە وردترو راستردا بگەڕێین . راســــتی‌ی ناپێکین گەربیتو بلێین پێنووسی نووسەرێکی کە ، لە پێنووسەکەی تۆلستۆی ناســـکو رەوانترە ، رەخنەگریش دەبێ لەبەر رۆشنایی ئەم شتانـەدا ئاوڕی لێ‌بداتەوە .**

**کاتێ ــ لە کتێبەکەی دەکۆڵینەوە ــ دەبینین مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ کە پرسیاری بابەتەکەی دەکات . ئاڵۆزی ئامانجی تۆلســـــتۆی دەبێتە کوســــــپێکی گەورە لەنێوان خوێنەرو تێکرای شێوازدا .**

**بۆیە ئەوەی ئێستا دەمەوێ کتێبێکی بابەت چەســـــپاوی وابێ رێگای چارەسەرکردنیشی بخاتەروو . بەڵام دەستنیشانکردنو دۆزینەوەی کتێبێکی ئاوا هەروا سووكو هاسان نییە ، بگرە زۆر گرانە ، ناشتوانین لەراستی لابدەین ، ئـەو نموونەیەی کـــە من بـــە دوایا دەگەڕێم « مدام بۆڤاری » یەکەی فلوبیرە .**

راســـتی ئەم کتێبـــە هەرچی چۆنێ‌بێت ، کەچی دوای ئەوەی چەند جارێکیش دەیخوێنینەوە هێشـــــتا دەتوانرێ بـــە رۆمانی نێو رۆمانەکـان دابنرێتو رەخنەش ناتوانێ پشت گوێی بخات. لە کاتێکدا باسی هونەر دەکەین دەبێ خۆمـــان ئامادەکـەین بۆ ئـەوەی لـــە فلوبیر بکۆڵینەوە ، رەخنەگرانیش ئەمە بە پێویست دەزانن ، گومانیش لەو رایانە ناکرێت ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن .

**« فلوبیر » ــ لە هەموو بارێکدا ــ ئاستێکی دیاری‌کراو تەواو دەخاتەڕوو ، فلوبیر لەو جۆرە کەســـــانە نییە کە چەنـد روویـەکی جیـــاواز دەخەنەروو ، بەمە یارمەتییەکشتیەکانی رێبازەکانی رەخنە پشــــتگوێ دەخـــات . چونکی فلوبێر ووشــــــەیەکی هەیەو دەیڵێو تەنها یەك مـانـا دەبەخشێ . بەمە خاڵێك دادەمەزرێنێ لەجیهانی رەخنەدا . ئەم خاڵەش بۆ هەمومان دەستدەدات هەرکاتێکیش بمانەوێ دەتوانین بچینەوە سەری ، لەوبڕوایەش داین لە بۆچوونی کەســــــانی کەشەوە هەمان پایەو جێگای هەیە .**

فلوبیر ئەستوونێکی پێەو دەداتەدەســـت

رەخنەگرەوە . سەبارەت بە ئامانجە تایبەتییەکەی خۆشم – کتێبی – مدام بوڤاری لە هیچ کتێبێکی تری ناچی ، رۆمانێکە ، بابەتێکی پتەوو ئاشکرای ئەوتۆی هەیە جێگای سەرلێشێواندنو شوێن گومکێی تێدا نابێتەوە تا ببێتە هۆی ئەوەی سنوورەکەی تێکبشکێنێ .

چیرۆکێ ، ئەم بابەتە چارەسەربکات دەتوانێ بگێڕرێتەوە بێ ئەوەی هەلقەیەکی وونبکرێت .

هەر وەکو لە نامە بلاوکراوەکانی نووسەردا دەردەکەوێ ، ئەم کتێبە زۆری لەسەر وتراوەو گەلێ لێکۆلینەوەی لە سەرکرا شتێکی سەیرە رۆژ لەدوای رۆژ گوێی لێبگرین بەلام نەگێشەیەك نە هەلوێستێکی نەگونجاومان نەبیست لەومادەیەی کە بابەتەکەی دەیخانەروو .

دەیتوانی نەفرەت لە چیرۆکەکەی بکاتو بێبوغزێنێ وە بە تورەبوونێکی واوە لێی بدوایە

هەروەکو بلێین – دەستی ناوەتە بیناقاقای – ئەمە کارێکی سەیرە چونکی بێزاری لە چوونە ناو ئەم کێشەیەدا هیچ پەیوەندی بەو تەنگوچەلەمەو گرانییەوە نییە کە لەکاتی نووسیندا .
معاناتەکەی هۆی ئەوە نەبوو کە چیرۆکەکە بەئاسانی خۆی بەدەستەوە نەدەدا ، کە دەبوایە بگێڕایەتەوە ، چونکی کتێبەکە رەگی لەمێشکیدا داکوتابوو سال لە دوای سال فلوبێر خەریکی بابەتەکەی بوو بێ ئەوەی هیچ شتێکی وای تیا بەدی بکات رێگای لێبگرێتو لەو هەولدانو دەربرینەدا ساردی بکاتەوەو بەو جۆرەی کە خۆی دەیەویست .

رەنگە فلوبێر لە بابەتەکە جارس بووبێ بەلام پەلوپۆی فلوبێری نەشکانو نائومێدی نەخستە دلەوە ، بۆیە لە رۆمانی بوڤاریدا شێوازەکان لەسەر سروشتیی خۆی دانراوەو لەگەل سەربەستییەکی تەواودا ، چیرۆکەکەش لەژێر دەستیدا وەکو مۆم وابوو کەسەکانیشی ئاشکراو دیارن .

رووداوە بچووکەکانیش بەرێکی ریزکراون .

بیری سەرەکی فلوبێر ئەوەیە چۆن چۆنی چیرۆکەکە پێشکەش بکاتو بەچی شێوەیەك بیگێڕێتەوە تا ئەو ئەنجامەی دەستگیربێ کە خۆی دەیەویست ، هەروەها چۆن کۆمەلی راستیی بچوك دەربخات تاکو ئەو مانایانە دەربڕن کە خۆی تیایاندا بەدیکردبوو . من باس لە « گێڕانەوەی » چیرۆکەکە دەکەم بەلام هیچ بیرێکی وای دەربارە نییە .

**هونەری رۆماننووسین کاتێ دەست پێدەکات ، رۆماننووس لەو بڕوایەدابێ چیرۆکەکەی وەکو بابەتێك ، دەبێ بەشێوەیەك ئاشکرابکرێو بخرێتەروو خۆی خۆی بناسێنێ .**

کاتێ راستییەکان وەك کۆمەلی زانیاری روت رووبەرووی خوێنەر دەکرێن دەبێتە جۆرە خۆپێشاندانێك . کتێب بریتی نییە لە ریزکردنی هەندێ راستی بەلکو وێنەیەکی نموونەییە ، سەربەخۆ هیچ شتێکی ئەوتۆ ناگەیەنن تا لە خزمەتی شتەکانی تردا نەخرێنەروو .

ئەوەی لێرەدا دەیخەمەروو چیرۆکە سادەکان نییە بەلکو هونەری رۆمان نووسینە بەگشتی . لەرۆماندا پەنا نابرێتە بەر هیچ دەسەلاتێك لەدەرەوەی کتێبەکە . چیرۆك – وەکو چیرۆکەکانی دیڤو – دەبێ دەستی یارمەتی بۆ شوێنێکی تری درێژبکەین ، دیڤو لە رێگای سەلماندنی ئەمانەتی مێژوویەوە هێناویێتە بەرهەم . بەلام لە رۆماندا ، کە دەقاودەق وشەی رۆمانی بەسەردا دەچەسپێ ، هێنانەوەی بەلگەیوا لەجێگای خۆیدا نییە ، ئەوەندە بەسە شتەکان وەکو راستییەك بخرێنەروو ، خستنەرووی ساکارانە ، شتەکان لە راستی نزیك ناخەنەوە .

لەگەل ئەمەشدا دەبێ رۆماننووس شتەکان بخاتەروو ، بدوێ ، چیرۆکەکەشی بگێڕێتەوە . چی تری دەتوانی بکات ؟ کتێبەکەی بریتییە لە زنجیرە .

**بەم جۆرە بارەکە روون دەبێتەوە . جیاوازی**

**نێوان هونەری « دیڤو »و هونەری « فلوبیر » تەنها لەشێوازدایە کاتێ شتەکان دەخەنەروو .**

**دیڤو رێگای راستەوخۆ دەگرێتەبەر کەچی فلوبیر رێگایەکی پێچاوپێچ دەگرێتەبەر . گەلێ لاریّ لەبەردەم فلوبیردا کراوەتەوە بەجۆری لەژماردن نایەن .**

مەبەستیش لەشێواز یاخود شێوازە جیاجیاکان : رێگای بەدی هێنانی مەبەستەکەیە .

فلوبیر دوای ئەوەی رێگاکەی دیاری دەکات دەیگرێتەبەر .

رەنگە لەو وێنەو درامایە بدوێین کەدایان دەهێنێ ، بە ئاشکرا دەلێین لە خستنەرووەکی رووت بەجارێك دوور دەکەوێتەوە ، چونکی لە ئاستی رۆماندایە گرنگ‌پێ‌داتەکە دەکەوێتە خانەیەکی ترەوە . بەکورتی ئێمە ئەو شێوازەمان بەلاوە مەبەستە کە زانیاریەکانی تیادا دەردەخاو دەیانخاتەروو .

رۆمان نووسێکی وەکو فلوبیر ، یاخود هەر رومان‌نووسێکی تری دەبێ کارەهونەرییەکەی هاڵدەرێکی رەخنەبێ ، هەر ئەوە چیرۆکەکە بگێڕێتەوە ، هەروەکو چۆن راپۆرتێکی رەسمی شت دەگێڕێتەوە . نووسەر دەدوێ .

**شێوازێکی ئاسك بەشێوەیەکی تایبەتی .**

**لەدوای لێبوونەوەیدا دەتوانین شێوازەکە بناسین رەنگە تازەی بکەینەوە ، دەبینین لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی‌تری دەگۆڕێ وەدەتوانین ئەو هۆیەش دەستنیشان‌بکەین کە ئەمەی هەڵبژاردووە .**

لە شێوازی رۆمانی مدام بوڤاری‌دا ئاڵوگۆڕێکی زۆری تێدایە ، هەرچەندە چیرۆکەکە سادەو هاسانە . دەبێ نرخی ئەم چیرۆکە چ بێ ؟! ..

**شالس بوڤاری لاوێکی سادەی لادێییە ، پیشەی دوکتورییە ، ژنێك دەخوازێ ، بەلام پاش ماوەیەکی کەم‌و دوای ئەوەی کۆمەلێ کێشەی بۆ پەیدا دەکات ژنەکەی لەدەست دەردەچێ .**

**دوا جار ، دلی لەکچێکی جووتیاری دراوسێیان دەچێ ، کچێکی تابلێی شۆخ‌و شەنگ بەلام ئەندیشەیەکی بەربلاوی هەیە .**

**دەیخوازێت زۆری پێ‌ناچێت لەژیانی ئەو شارۆچکەیە وەرس دەبێت دلدارێك بۆ خۆی پەیدا دەکات ، وازی لێ‌دێنێ‌و یەکێکی‌تری دەدۆزێتەوە تابیتاقاقای دەکەوێتە ژێر باری قەرزارییەوە لە ئەنجامدا ژار دەخواتەوەو دەمرێت .**

**دوای مردنی . بۆڤاری خیانەتکاری ئەم ئافرەتەی بۆ ئاشکرادەبێ بەلام بیبرتەسکی ئەم کابرایە تووشی خەم‌و دلەراوکێ دێنێ سەری دونیای لێ‌دێتە یەك ، تووشی خەم‌و ئازارێکی زۆر دەبێ‌و دەمرێت ..**

ئەمە کورتەی چیرۆکەکەیە ، ئەم کورت کردنەوەیە هیچی وامان دەربارەی فلوبیر بۆ ئاشکرا ناکات . رەنگە گەلێ بابەتی‌تری لەم چیرۆکەدا هەبێ لەگەل گەلێ باری سەرنجی تری‌دا بە جۆرێك راستیە ئاساییەکان کتێبێك پێك بهێنن . بەلام ئەو رێگایەی راستیەکانی پێ‌خراوەتە روو بەگشتی پشت بەو بابەتە تایبەتییە دەبەستی کە فلوبیر تیایدا دەیبینێ . وە نابێ رەخنە لە شێوازەکە بگرین تاکو ئەم لایەنە روون نەبێتەوە . بەلام دەتوانرێ چاودێری بکرێ دەبینیش فلوبیر بەجۆرێك بابەتەکەی پێشکەش دەکات کە لە لایەکەوە بولایەکی تری دەگوڕێ .

هەندێ جار وادەردەکەوێ فلوبیر وەسفی ئەو جێگانە دەکات کە بینیویە ، یا ئەو کەسانە ناسیونی ، یا ئەو ووتانەی کە گوێی لێیان‌بووە ، لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە فلوبیر دەقاودەق تاقی‌کردنەوەکانی وەکو خۆیان دەگێڕێتەوە ، بەلکو وایان دەنووسی وەکو وا بووبێ ، پیاهەلدانەکەی لەم بارەدا ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کە بەو جۆرە من‌و تۆ لێی بکەین ، هەر وەکو بەراستی لەو ئانەدا لەو جێگایە بووین . مەبەستی لەمەدا ئەوەیە دیمەنەکەمان بخاتە بەردەم ، هەروەکو وێنەیەك کە بەرەبەرە بۆمان ئاشکرا

دەبێ یاخود وەکو شانۆگەریەك لە پێش‌چاوماندا پێشکەش دەکرێ .

شـــێواز لێرەدا جارێکی‌تری دەگۆڕێت .

لێرەدا بارێك دێتەتاوەوە لەبەر چـەنـد هۆیـــەك پێویســـت دەکات ، لـــە تەماشاکردنێکی روت‌و بیســتن ئاسایی زۆرتری لێوە فێربین . فلوبیری نووســـــەر دەبێ خۆی تێ‌هەلقورتێنێ . ئەگەر بەشێوەیەکی راست لەروداوێ نەگـــەی ، یاخود دۆش دابمێنی بەرامبەر چەند ووتەیەك کە نووسەر پەنجەی بۆ درێژدەکات . هۆی ئەمە دەگەرێتەوە بۆ رابوردووی ئەوکەســـانە کـــە دەجولانەوەو دەدوان .

بەم جۆرە نووســـــەر ئەو شـــتانەمان یاد دەخاتەوە کە ئێمە رێی پێ‌نابەین ، بـۆ ئـەوەی رۆشنایەکی تازە بخاتە سەر دراماکەوە ، یارەنگە نووسەر ـ کە شارەزای هەموو شـــتێکە ، بگرە شارەزای بیرو ئەو نهێنیانەیە کـە کەســـەکان دەری‌نابڕن ـ دەیەوێ نەك تەنها هاوبەشی بوڤاری بکەین لـــە ووتەوکرداردا بەلکو هاوبەشی‌ی راوو بیرکردنەوەشـــیان بین . ئەمە ســـەرچاوە ئاساییەکانی چیرۆك نووسەکە هەریەکەی وەکـو مادەیەك بەکاردێنێ . شتێکی سروشتیە ســـوود لەمە وەربگرین ، چونکی ئەگەر بەچاوی مەبەست تەماشای ئامرازەکانی نووســـــەر نەکەین ئـەو ئامرازانە لەیەکیکیەوە بۆ یەکێکی‌تری دەگوێزێتەوە دەست‌نیشان نەکەین ناتوانین هەســـت بـەو گۆرانکاریـــە بکەین . چیرۆکەکەی بـەرێکایـەکی ئاســـایی‌و روون‌و بێ زۆرلەخۆکردن دەگێرێتەوە بەلام ئەو جیاوازیە لە راستیدا جیاوازی شێواز ( الاســـــلوب ) دەگەیەنێ ، کـــە جیاوازیەکی بنەچەیە . ئەگەر چیرۆکەکە داوای خستنەرووی لێ‌بکرێ ، لەگەل یەکەم ووشەدا پرســـــیارێك سەرهەلدەدا : پەیوەنـدی ئێمە بـە چیرۆکەکەوە چی‌یەو جێگای ئێمە ســـەربارەت ئەو چیرۆکە لەکوێ‌دایـە . ئـایـا ئێمە لـە بۆنـەو کاتێکی هەلبژێراودا ژیانی ئەوکەســـانەدا کـــە دەبێ شوێنیان بکەوین ، خراوینەتە بـەردەم دیمەنێکی تایبەتیەوە ؟ . یاخـــود ئێمە لـە بەرزاییـــەوە دەروانینە ژیانیان‌و هاوبەشی ئەو دەســـــەلاتە دەکەین کە بە نووسەر دراوە ؟ ، کە بەتێ‌روانینێکی فراوانەوە بۆ مێژوویان دەروانێ .

لە راستیدا فلوبیر لە پێشـــدا دیمەنێکمان پێشکەش‌دەکات ـ دیمەنی گەیشتنی بۆڤاری بـۆ قوتابخانە کەنجێکی تازە هەلچووە ، روداوی ئەو سەرلەبەیانیە تایبەتیەمان بۆ دەگێرێتەوە ، واز لەو رووداوە دێنێ ، کورتـــە ژیانی رابوردویمان پێ رادەگەیەنێ بـاسی دایك‌وبـاوکی دەکـــات ، گوزەرانیان ، ئەو مالەی کە تیایدا دەژی دواجـا ژیانی ئەم دوایەی وەکو قوتابییەك .

بەشی زۆری رۆمانەکە بەم رێبازە پێشکەش دەکرێ ـ دیمەنی دەســـت‌پێ‌کردن ـ گەرانەوەی رووداوەکـانی رابووردو دواجـا کورتـەیـەکی . خوێنەریش وا راهاتووە پێشەکی هەســـــت بەلادانی کوت‌وپڕ دەکات .

ئەمە یەکێ لە خاسیەتەکانی شێوازە ، ئەو راستیە دەگەیەنێ : کە لەبابەتێکی ســـــەرەتایی واشدا زاراوە هونەریەکە چەسپاوتیە .

بۆ پێشکەش کردنی راستی چیرۆکەکان چۆن توانیمان لەنێو ئـەو رێبازانەدا جیای بکەینەوە . زانینی‌ی کارێکی ئاسان نیە هـەروەکـو چـۆن ئێدیۆمێکی گونجاومان نیە بۆ دەست‌نیشـــــان کردنی لەنێوان شین‌و ســـووردا . بەلام با ئێمە بلێین خســـتنەرووی دیمەنی « الشـــهدی »و بانۆرامی لە چیرۆکەکەدا ناکۆکیەکی ئاشـــکرا دەردەبرێ .

جارێکی‌تریش مەســـەلەی پەیوەندی ئێمە دێتە ئاراوە ، پەیوەندی خوێنەر بـەدانـەرەوە . بەشێوەیەکی گشتی فلوبیر بەنووسەرێکی بابەتی‌ی دادەنرێ . خۆی ـ لا ـ دەگرێ‌و حەز بەوە دەکات هەست بەبوونی نەکەین ، چیرۆکەکەمان دەخاتـە بەردەست‌و خۆی بێ‌دەنگ لێ‌دەوەستێ .

بـــەلام دەبێ ئـەوەش بلێم ئـەم‌لایـەنـە گـــران‌کـــەوتـــەوە . ئـــەو دەگـــەیـــەنی فلوبیـــر لـەزۆر جـــاردا رای خـۆی ئاشکرا ناکات ، بۆیە لەم رووەوە دەمەتەقێ‌یەك گەرم‌بوو ،

گوایە نابێ نووسەرێی هونەرمەند رای خۆی لە چیرۆکەکەیدا دەربڕێت . بەڵام دەبێ ئەوەی خۆی بڕوای پێیەتی لە بابەتەکەیدا رەنگبداتەوە . بەتایبەت کتێبەکە لەوجۆرە کتێبانەیە کە گەلێ نموونەی ژیانی تێدایە وە بە ئاشکرا بۆچوونورای فلوبیر دەردەخات .

فلوبیرو چەند کەسێکیکەی وەکو فلوبیر کە بە « موضوعی » بەناوبانگن لەوەدایە کە بەبلیمەتیو لێهاتوویەوە هەستی خۆیان دەردەبڕنو لەبارێکی زیندوودا دەیخەنەروو . لە باسی پەیوەندیماندا بەنووسەرەوە بۆ ئەم بابەتە پەنجە درێژ ناکەم : مەبەستم لە راکانی فلوبیرە بەرامبەر بەبۆڤاریو رابووردووی ، گومان لەوە ناکرێ بابەتێکە هیچ جۆرە خێلوخیچییەکی تێدانییە .

کێشە ، کێشەی شێوازە ، هەندێ جار نووسەر بەدەنگی خۆی دەدوێ ، هەندێ جاری تریش بەهۆی یەکێ لە کەسەکانەوە دەدوێ – لێرەدا گەلێ جار لەنێوان ئیماوە دەدوێ – بەم پێیە دیمەنی لادێ وەسف دەکات ، کە بەشی ئیمای تێدایە ، یا روالەتو دیمەنی هاوسێکانی وەسف دەکات ، ئەمانە هەمووی بەزمانێکی تایبەتیو ئاستێکی گونجاو دەخاتەروو .

ئەو شتەی لەمێشکیدایە دایدەرێژێ دواجا چاو بیرو ئاستی یەکێکیتری بەکاردێنێ . دیمەنی لادێ ، ئەو دیمەنو رەنگانەیە کە ئیما دەیبینێ . رووداوەکەش بەجۆری چارەسەردەکری لەگەل ئەندیشەی ئیمادا بگونجێ . فلوبیر کشاوەتەدواوە ، ئێستا لەگەل ئیمادا مامەلە دەکەین .

بۆ وێنە بابروانینە کەسایەتیی دوو دلدارەکەی ئیما . رودولفو لیون ، ئەگەر فلوبیر باسی ئەو دووکەسەی وابکردایە وەکو فلوبیر دەیانبینێو لای لەولایەنە نەکردایەتەوە کە بەلای ئیماوە چیدەگەیەنن ، ئەوا زۆری درێژی نەدەدانێ هەردوو بەلای فلوبیر خۆیو رەخنەگرانیشەوە بە شتێکی ساکارو سادە دادەنران . گرنگی ئەم دووانە لەوەدایە کاریان سەر ئافرەتێکی بێمێشکی هیچ لەبارا نەبوو .

با جارێکیتری رووداوێکیتری بێنینە پێشەوە ... ئاهەنگی سەماکردنەکە کە جارێکیتری خەونە رۆمانسیەکانی هەر دەکاتەوەو بەجۆرێکیش خراوەتە روو لەگەل زمانەکەدا بگونجێ ، لەچاو « ئیماوە » شتەکان خراونەتەروو جار نەجارێك « ایما » لەیاد دەکرێو گرنگی بە یەکێکیتری دەدرێ . ئێمەش لەلای خۆمانەوە تێروانینێکی خێرامان دەست دەکەوێ زۆرشت لەچاوی میردو خەسوو دایکیو دلدارەکەیدا دەخوێنینەوە ، سەرەڕای ئەمە گەرچی دەنگەکە دەنگی نووسەرەکە بێ یاخود دەنگی یەکێ لە کەسەکان بێ بەشێوازی دیمەنگرتن ( الاسلوب التصويري ) چارەسەر بابەتەکەکراوە . لەگەل ئەمەشدا رێبازێکیتری بەکار هێناوە ئەویش رێگای درامییە . هۆی ئەمەش رەنگە لەوەدابێ « انطباع » – وەك ئاهەنگی سەماکردنەکەی لای مارکیز – وەکو وێنەیەك پێشکەشکراوە کە رەنگدانەوەی رووداوێکی تایبەتی لە ئاوێنەی هەستێکی تیژی یەکێکدا . خوێنەر ئەوەندە بۆنەکەی بەلاوە گرنگ نییە یاخود تەنها جار نەجارێك ئاورێکی لێدەداتەوە خوێنەر چاودێری هەلچوونی ئارەزووەکانی « ایما » دەکات .

ئەمە پێی دەلێن دیمەنی « مشهدي » . بەومانایەی ئەم ووشەیەمان پێش ئێستا بەکارهێنا . ئێمە کاتێکی دیاریکراومان بەلاوە مەبەستە ، بەرامبەر بەتاقیکردنەوەکانی « ایما »ش بۆچوونی تایبەتی خۆمان لا پەیدا دەبێت . هەرچەندەش ئەمە دیمەنێك پێكدەهێنێ ، بەلام بەشێوەیەکی درامی ناخرێتەروو . بۆ وێنە ئەگەر بێتو ئێمە دەمەتەقێکە لا بدەین ، چیتری دەمێنێ کە نووسەر باسیان دەکات – کەسەکان – کەلوپەل – سەماکردنو ئاهەنگەکان – ئەمانە هەمووی بخەسەر تەختەی شانۆ بۆ ئەوەی پێشکەش بکرێن . دەبینین ئەو کارێ کردنە سەرسوڕێنەرەی بۆنەکە تامێکی ئەوتۆی نامێنێ کە کتێبەکە باسیکردووە . هیچشتێك لە دیمەنی نێو کتێبەکە بابەتیو دیاریتر نییە ، دیمەنەکەی ئەوێش خوو ئارەزووەکانی ایما داپۆشیون .

نرخ پێدانی ئێمەش ، کە لەوکاتەدا شتێکی

ئاسایە طبیعەتی ئەو ئاوو هەوایە دەبگرێتە خۆیەوە . لۆردو خانمەکان لە دیمەنەکەوە دوورن ، بەخیلیو هەڵچوونی « ایما » وێنەی پێشەوەی دیمەنەکە پردەکەن . بابێینە لای رووداوێکی‌کەوە ، روداوی کۆمەڵی کشتوکاڵی . پێشانگای ئاژەل لە یونفیل ، قەڵەبالغەکەی بازارو دابەش‌کردنی پاداشتو ووتەدان ، ئەم دیمەنە وەکو هەر دیمەنێکی‌تری هەمووی ـ شێوەی نووسینی فلوبیر جۆرە تێکەڵاوکردنێکی تێدایە لەم‌کاتەدا دەتوانین بزانین لەبەرچی‌یە ـ لە بۆ چوونی « ایما » وە دەخرینەروو کە بەتەنیشت « رودولفە »وە دانیشتووە ، رودولفیش لەژێر پەردەی زمان پاراوییەوە ،دەیەوێ بەرەبەرە لێی نزیك‌بکەوێتەوە . بەم جۆرە شتەکان خۆیان بۆ خوێنەر ئاشکرا دەکەن . بەڵام بڕوانە راستی دیمەنەکە لەم‌بۆنەیەدا لەگەڵ سەرەتاکەدا دەگونجێ .

گوێ لە رستە رازاوەکانی ئەندامی ئەنجومەن دەگرین ، هەروەها وەڵامەکانی « ایما »ش دەبیسین ، هەندێ جاریش گوێمان لە هەڕەشەو هێرشی خەلکەکەیە ، ئەم دیمەنە دەتوانین فیلێکی لێبکەین‌و بیخەینە سەرشانۆ بەشێوەیەك بتوانین ( تصوری ) بکەین بێ ئەوەی ئەو وێنەیەی لە مێشکماندایە لەبیربکەین کە دیمەنەکە دەبوایە لە کتێبەکەوە بگوازتایەتەوە .

ئایا دانەر لەکاتێکی دیاری‌کراودا دەست بە نووسین‌دەکات کە گرنگی بەچەند رووداوێکی تایبەتی‌داوە ، یاخود چاو بەو رواڵەتو رەنگەدا دەگێرێ کە دەبێ لەبیری کەسێکدا هەبێ ؟ رەنگە نووسەر لە نووسینەکەیدا هەردوو بارەکەبکات ، رەنگە ئەمە لە لاپەڕەیەکدا یا لەرستەیەکدا رەنگ‌بداتەوە . هیچ‌شتێك نییە رێگای ئەوەی لێبگرێت کە لە هەردوو بارەکە سوود وەرنەگرێت ئەگەر هاتو لە سوودی چیرۆکەکەدا بوو .

لە راستیدا هەندێ جار وارێك‌دەکەوێت نووسەرێك دەبینین تەنها پەنا یاخود سوود لە یەکێك لەم شێوازانە وەردەگرێت ئەمەش بۆ بە دیهێنانی لایەنێك لەلایەنەکانی بیرەسەرەکی‌کەی بەکار دەهێنێ کە چاکترین رێگابیگرێتەبەر بو پێشکەش‌کردن‌و خستنەرووی یەکێ لەو رێگایانەنە .

رۆمان‌نووس سەربەستە لە هەڵبژاردن‌و پەنابردنەبەر سەرچاوەکان گەر شانۆ مەبەستەکانی بۆ جێ‌بەجێ بکات پەنای بۆ دەبا ، یاخود پەنا دەبابۆ پیاهەڵدان‌و وێنەگرتنی شتەکان گەرهات‌و شێوەی چیرۆکە پێویستی بە بەکارهێنانی ئەمانە هەبوو . بەڵام تەنها یاسایەك رێگای لێدەگرێ ئەویش دەبێ پلانێکی دیاری هەبێ خۆی پێوەببەستی‌و لێی‌لانەدات رەخنەگر لەشتێکی سەرەکی دەکۆڵێتەوە : شێوازەکان چۆن تێکەڵ‌بەك کراون‌و سوودیان لێوەرگیراوە ، هەروەهاش بەدوای بابەتەکەدا دەگەڕێ‌و وەتاچ رادەیەك لە خزمەتی یەکتردان ، لەکاتێکدا بابەتەکەش پەرەدەسێنێ‌و بەرەوپێش دەڕوات .

بەم‌جۆرە لەرێگای ئەو شێوازانەوە کە بە ( دیمەنی )و ( بانورامی ) ناوم بردن مرۆڤ بەردەوام دەبێتە چاودێری‌کەر بۆ ئەوەی ببینێ‌و بزانێ چۆن دەخرێتە ئاستی خوێنەرەوە .

بەکشتی چاوەڕوانی ئەوە دەگەین ئەم‌دیمەنە دەکەوێتە ژێر رکێفی کورتەی مێژوویی‌یەوە ئەمەش لەلایەن خۆیەوە رێگا بۆ ئەو بۆنەیە خۆش‌دەکات کە دەیهێنێتەکایەوە .

دیاری کردنی ئەم بۆنەیە لەوێدا روودەدات هەموو شتێکی لەلائامادەبێت ، هەروەها رۆشنایی دەخاتەسەر لایەنێکی بابەتەکەو بەرەو پێشەوە بردنی لە قۆناغێکی دیاری‌دا . ئەم دەستنیشان کردنەش لەولایەنانەیە کە نووسەر لەدانانی پلانی کتێبەکە گرنگی‌یەکی زۆری پێداوە .

ئەو دیمەنەی ئەوەندە پێویست نەبێ‌و کارێکی گرنگ نەگێرێ ـ ئەو دیمەنەی بەهۆی ئامادە نەکردنیەوە هیچ ئەنجامێك نادات بەدەستەوە ، لایەنی لاوازی چیرۆکەکەیە ، دەبێ نووسەر وریای ئەم لایەنەبێت ـ .

هەرچی چۆنێك‌بێ گومان لەوە ناکرێ : دیمەن جێگایەکی بەرزی هەیە بەو پێیەی دەبێتەمایەی وورووژاندنی گەلێ پرسیارو لێ‌روانین . ئێمە رەنگە لەلاپەڕەی‌یەکەمدا دیمەنێك ببینین یەکسەر بیرمان بۆ لای ئەو کەسانەدا دەچێ کە دیمەنەکە گرنگی‌پێ‌داون . دیمەنێکە لەهەرپۆپەیەکو دەرامەدانەوەی

پرسیارەکاندا لەزەینیدا دووبارە دەبێتەوە ، بەم جۆرە ئەوشتەی کە دیمەنەکە دەستی پێ‌کردبوو بەتەواوی دەردەکەوێ .

لە رۆمانی « مدام بوڤاری »دا دیمەنەکان بە لێهاتوویی‌و شارەزایانە دابەش دەکرێن ، لەهەر خوێندنەوەیەکی تازەشدا زۆر شتی‌کەش بەدەستەوە دەدات .

ئاهەنگی سەماکە ، کۆبوونەوەکان ، ئێوارەی شانۆکە ، بەیەك گەیشتنەکەی نێوان « ایما » و « لیون » لە کەنیسەکەدا ، دانیشتنەگرنگەکەی پیاوە ئاینەکەو دەرمانگرەکە لەسەرەمەرگی « ایما »دا ، ئەمانە هەمووی کۆڵەکەو سیستەمی دروستکردنی کتێبەکە پێکدێنن ، دواجاش هەر قوناغێکی بەشێوەیەکی رێك ئاراستەدەکرێن .

لەوکاتەی دەگەینە دیمەنەکە ، هیچ شتێك روو لە بۆنەکان ناکات . رووداوەکان تەختبوون‌و شوێنەکەش دەنگی دەداتەوە ، بەدوای ئەمەدا رووداوەکە دەبێتە کلیلی چیرۆکەکە ، و دەبێتە سووچێکی چیرۆکەکەو بۆچوون‌و تێڕوانینیش بۆسووچێکیتری دەڕوانێ .

ئەو کورتکردنەوە خێرایەش کە بەدوای ئەمانەدا دێ ، بینینێکی خێرای ژیانی « ایما »یە کە جارێکیتری بەردەوامی بەکتێبەکە دەدات‌و بەرەبەرەش بەرەو پۆپە دەبیات کە پێشەکی هەستی‌پێ‌دەکەی .

دەبێ نووسەر لەنێوان کام لەکەسەکانەوە خۆی ئاشکرا بکات ، یان دەبێ لە پشت کامیانەوە بوەستێ‌و بیروهەستی چۆن ئاشکرا بکات .

من لەو باوەڕەدام چیرۆکێکی نەنووسراو لەبەردەمیا قوتدەبێتەوە . وەهەر وەکو هەرشتێکی بابەتی ، هەمووشتێك لەدەرەوەوە دەبینرێ زنجیرە رووداوێکی بەیەکەوە بەستراوو ژن‌و پیاوەکان لەجێگای خۆیاندان . یاخود دەتوانرێ چیرۆکەکە لەوبارە بهێلرێتەوە لە کاتی نووسیندا ، کاتێ کتێبەکەش کۆتایی پێ‌دەهێنرێ برێتی دەبێ لە کۆمەڵێك شت هەروەکو نووسەر لە دەرەوەی رووداوەکە بێ. وای دەبینێ بێ‌ئەوەی نهێنیی‌کەس بدرکێنێ .

لە هەندێ شوێن‌دا نووسەر دەبێ خۆی هەڵقوڵێنێ‌و پەنجەبدا لەشتە نهێنیەکانی کەسەکان‌و ئاگاداری جۆری بیرکردنەوەیان بێت ، ئامانجیشی لە گواستنەوەی بۆچوونەکان لەوە زیاتر نییە کە پێویستی پێ‌دەبێ . ئەگەر لەتوانادا هەبوو و بۆی‌لوا بابەتەکە بەتەواوی‌و کاملی

پێشکەش‌بکرێ لەروانگەی یەکێ لەکەسەکانەوە ئەوکاتە پێویست بەهەندێ شتی زێدە ناکات .

ئەگەر چوونە نێو دەروونی کەسەکان بێ‌سەروپێ‌بوو یاخود پێویست نەبوو ، لەسەر لێشێواندن بەولاوە هیچ ئەنجامێکیتری نادات بەدەستەوە .

بەڵام ئەو تەوەرە کامەیە کەبیر زاڵ‌دەکات بەسەر بابەتەکەدا ؟ وەڕامی ئەم‌پرسیارە دەستبەجێ خۆی نادات بەدەستەوە ، لەو رۆمانانەش کە دەیانخوێنینەوە هەموو کاتێ بەئاشکرا نییە . گومانیش لەوە ناکرێت لە زۆر چیرۆکا لەگەرمەی رووداوەکاندا یەکێك هەیە ئەمە لێك‌دەداتەوە رووداوەکەش لە ئەنجامدا رووبەرووی هەڵوێستی ئەوکەسە دەبێتەوە .

لە رۆمانی فلوبیردا « مدام بوڤاری » هیچ پرسیارێك نییە پێ‌بکەین ، بەڵام دەبێ چاوی « ایما » بەکار بێنین ، چونکی کرۆکی بابەتەکە لە تاقی‌کردنەوەکانیدایە نەك لە جێگایەکی تری ، لەو راستییە مادیانەدا دەردەکەوێ کە لەدەوروبەری‌دایە ، لەگەڵ ئەمانەشدا هەروەکو پێشوو ووتمان ، فلوبیر لەو باوەڕەدایە کە جار نەجارێ ئاوڕی لێ‌بدەیتەوە . فلوبیر بۆچی ئەمە دەکات ؟ پیاچوونەوەو تەماشاکردنی بابەتەکە هۆکەیمان بۆ ئاشکرا دەکات . ئێستا رەگەزەکانی شێوازی نووسەرمان لەبەردەمدایە ، لە راستیدا ئەم رەگەزانە سادەو کەمن ، بەڵام دەسەڵات‌و توانایەکی زۆریان لەباردایە ئەویش لە ئاوێتەو تێکەڵاوکردەتەدا دیارە ، وە بەشێوەیەکی‌وا رێکخراون لەگەڵ هەموو بیرێکی سەرەکی‌و تازەدا بکونجێ کە نووسەر دەستی بۆدەبات .

ئێمەش لەلای خۆمانەوە هەست بەیەکگرتن‌و یەك‌بەدوای یەکی ئەم رەگەزانە دەکەین . ئەم بۆچوونانە کە لە ئاوێتەبوونی کرداوی درامی‌یە پێك‌هاتووە بەشێوەیەکی

فوتوگرافی‌و پیاهەڵدانی فوتوگرافیانە چارەسەر دەکرێن‌و بەشێوەیەکی درامی پێشکەش‌دەکرێن . ئەم بۆچوونە بەومانا تایبەتییەی کە باسمان‌کرد ئاشکرادەبێ . لەکارێکی چاکدا دوزینەوەی شێوەکان‌و چۆن پێکەوە رێك‌وپێکی بە چیرۆکەکە دەدەن کارێکی بەتام .

هەول دەدەم هەندێکیان جیابکەمەوە ، لەو باوەرشدام هەولدان بۆ گەیشتن لەرومانەکە لەجێی خۆیدایە ، تا ئێستا ئاورم لە هەندێ خصائص‌و رێبازی رۆمانەکەی فلوبیر داوەتەوە ، جێگای خۆشیەتی ئێستا لەهۆکانی بدوێم‌و بەشێوەیەکی ورباتر لەگەڵ کتێبەکەدا ئالوگوربکەم فلوبیر بەچەند رێگایەکی جیاجیا چیرۆکەکەی دەگێرێتەوە ، تا بەرەوپێشەوەش بروا ئاشکراتر دەبێ ، بۆئەمەش بەلگەی تایبەتی خۆی هەیە ، کاتێ هەر ووشەیەك هەلدەسەنگێنێ‌و بەو پەری حیساب بۆ ئەنجامەکەی دەکات ، ئەوە ناگەیەنێت پابەندی رێکەوتە ، یاخود شێوازەکەی فەرامۆش دەکات ، رێگایەك هەلدەبژێرێ پشت لەرێگایەکی تری‌دەکات چونکی لە هەندێ کێشە دووری دەخاتەوە ، یان نەیتوانیوە دەرك بەوەبکات کە گەلێ رێگای تریش هەیە ، یاخود هەموویانی وەکو تاقە رێگایەك بینیوە . لەگەڵ ئەمانەشدا بەتەماشاکردنێك ئەوە ئاشکرا دەبێ ئەو رێگایەی بابەتەکەی پێ‌پێشکەش‌دەکات ــ ئەگەرچی بابەتەکە لێرەدا « ایما » بوڤاری‌یە ــ رێگایەکی عرضی‌یە . لەنیو هەموویاندا لە ــ شارلس ــ ەوە دەست پێ‌دەکات ، شارلس‌ی گەمژە کەپابەندی جوانی ــ ایمایە ــ بێ ئەوەی حیساب بو خووو رەووشتی بکات .

هەروەها لە رابوردووی شارلس‌ەوە دەست پێ‌دەکات ، دواجار دێتەسەر پەروەردەکردنی‌و ژن‌خواستنەکەی کەدایکی بەزور بەزۆر بەسەریا چەسپاندووەو دواجاش بەداخیەوە دەمرێ .

وارێك دەکەوێت « شارلس » بۆ سەردانی بۆ کێلگەیەك دەچێ‌و لەگەڵ « ایما »ی کچە جووتیاردا یەك‌دەبینن بەم‌جۆرە لەکۆتایی‌دا بابەتی چیرۆکەکە دەدۆزینەوە .

ئایا ئەمە شیاوترین‌و گونجاوترین دەقە بۆورووژاندنی بابەتەکە ؟ فلوبیر لەکردەوەکەی خۆی یەکجار دلنیایەو بروای بەخۆیەتی ، بەلام جێی خۆیەتی گەر بپرسین : فلۆبیر چی‌دەوێ ؟

بابەتی سەرەکی ــ فلوبیر ــ بەپلەی یەکەم « ایما » بوڤاری‌یە . کتێبەکە بریتی‌یە لەوێنەی ئافرەتێکی رومانسی لەبارێکی ساکارو ئاسایی‌دا . کتێبەکە هەمووی بەدەوری ئەودا دەخولێتەوە . بەلام « ایما » بۆ لەوێدایە ؟ .

بابەتی راستەقینەی رۆمانەکە وەکو کورت کردنەوەیەکی رووتی رێرەوی چیرۆکەکە نابێ بخرێتەروو . رەنگە نووسەر ( ایما )ی لەبەر « ئیما » خۆی لەوێدا دانابێ ، یا لەپێناوو لەبەر ئەو تەنگ‌و چەلەمەیەی کە تێی کەوت . یاخود وەك نموونەیەك دەیخاتە پێش‌چاو کۆمەلێ پرسیار قیت‌دەکاتەوەو بۆ ئەوە دەشێت ببێتە مایەی لێکۆلینەوەو لێ‌دوان . لەوانەشە بەلای فلوبیرەوە ئامرازێك‌بێ‌و بۆ زنجیرە رووداوێك بگونجێ . کێ دەلێ فلوبیر بەو چاوەوە تەماشای یەکێ لەو نموونە گونجاوانەیە کە قابلی ئەوەیە ببێتە وێنەیەکی بەرزو سەرنج راکێش ، یان هێزێکی پەرش‌وبلاوەو ئاوێتەی ژیانی کەسانی دەوروپشتی دەبێت .

دوای بابەتی « ایما »و راستی تەبیعەتی‌و بابەتی ئەو ئاووهەوایەی تیادا دەژی ، دەتوانین بلێین گەلێ بابەتی جیاوازو هەمە رەنگی شاراوە لەم کێشەیەدا خۆی مەلاس‌داوە . پیاوان ، ژنان بە گفت‌و کرداریانەوە لەگەڵ ئەو دیمەنەی لە پشتیانەوەیە ، ئەمانە گشت نابنە کلیلی دەرگای مەسەلەکە . ئەبێ بەدوای ئەو بیرەدا بگەرێین کەبووە بە بنەچەی نووسینی ئەم‌کتێبە . ئێستا ئەگەر وای‌دابنێین « ایما » بەتەنها هەروا بۆخۆی هێنراوەتە ناوەوە چونکی خووڕەووشتی « ایما » سەرنجی فلوبیری راکێشاوە بە بابەتێکی دلکەرەوەی داناوە ــ ئەگەر ئامانجی سەرەکی فلوبیر ئەوە بووبێ ، ئافرەتێکی‌وا دروست‌بکات بابەتەکانی‌تری هەروا دەرواتو ئێمەش دەزانین چۆنی تەماشا دەکەین ــ ئەو باروزروفەی کە « ایما » خۆی‌تێدا دەبینێتەوە نووسەر هەلیانی بژاردووە ، چونکی رۆشنایی دەخاتەسەرو خاسییەتە شروشتی‌یەکانی دەردەخا ، بۆ ئەوەی چاك‌ترین هەلی بۆ برەخسێنی بۆ دۆزینەوەی

راستی کەسایەتی‌خۆی . مێردگێلەکەی‌و دڵدارەکانی دەچنە نێو دیمەنێکەوە بۆ ئەوەی راستی « ایما » دەرکەوێت . فلوبیر بەدەستی مەبەست لە شاروچکەیەکدا دەری‌دەخات ، کەپڕە لە کەسان‌و واقعێکی نائاسایشی پێ‌دەبەخشێ . ئەم شارە ، شارێك نییە کوت‌وپڕ قووت بووبێتەوە ، شارێکی گشتی نییە ، بەڵام وەکو شارێك خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیەو دەتوانرێ بناسرێتەوە . لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر وای دابنێین « ایما » بۆخۆی هەموو بابەتەکەی فلوبیرە ، لەسەری واپێویست دەکات ، رۆشنایی بخاتەسەر ئەم شارۆچکەیە ، چونکی شارەکە دەبێ بەهۆی ئاشکرا کردن‌و پەردە لەروو هەڵماڵینی ئیما .

ئەگەر لەو باوەڕەدابوایە : کە ئافرەتێکی رۆمانسی‌و پڕ لە ئارەزووی وەکو ئیما ، لە ئاوو هەواو جیهانێکی کەی تری‌دا باشترو بەهێزتر دەردەکەوێت ، سێ‌و دووێ لێ نەدەکردو بەشێوەیەکی جیاوازو لە دونیایەکی کەی تری‌دا دایدەنا . بەشێوەیەکی کە دەمان بینی ، لەو بارو زروفە تازەیەشدا نە « شالس » وەنە « رودولف » وە بەر چاوان نەدەکەوتن . لەبری ئەمەی ئێستاش بارو زروفێکی جیاوازتر سەری قوت‌دەکردەوە . جیهانی « ئیما » هەروەکو « فلوبیر » لە کتێبەکەیدا دەری‌خستووە بەو چاوەوە تەماشا دەکرێ کە بە ئەنجامێکی گونجاو گەیشتووەو لەجێگای خۆیدایەو بۆ نەش‌ونماکردنی ئیما رەخساوەو دامەزراوەو لەپێناو بەرژەوەندی ئیمادا بنیادنراوە . دەتوانین بڵێین جیهانی ئیما دەگەڕێتەوە بۆ چارەکردنی چیرۆکەکە ، دەبێ ئەوەش بووترێ جیهانی ئیما جیهانێکە دەستێوەردانی هەموو شتێك دەشیوێنێ‌و بەهیچ جۆرێ ناتوانرێ لەبارو زرۆفێکی جیاوازتردا لەو بارو زرۆفەی تێ‌یدایە بگوێزرێتەوە ، بە پێچەوانەشەوە بیرو مەبەستی سەرەکی رۆمانەکەی فلوبیر ئاڵۆز دەبێ .

**لەلایەکی‌ترەوە ئێما بابەتی سەرەکی کتێبەکە نییە ! مەبەستی فلوبیر خستنەرووی مێژووی ئافرەتێکی وەکو ئێمایە .**

لەلایەکی‌کەشەوە بوونی ئیما لەو بارو زروفە

که تیایدایە کارێکی پێویستە . بە پێیە « مدام بوڤاری » نەخستنە رووی دیمەن‌و نە لێکۆڵینەوە دەربارەی کەسانێکی تایبەتە بەڵکو خاسیەتی سەرەکی ئەم شانۆگەری‌یە ، دوو ئەکتەری سەرەکی تێدایە لەلایەك ئافرەتێك‌و دەوروپشتەکەی لە لایەکی‌ترەوە زورانبازی‌و مل‌ملانی‌و تاقی‌کردنەوەی هێزو کێشەیەکی سەرنج راکێش لە ئارادایە .. گومان لەوە ناکرێ ئێما لەوجۆرە کەسانە نییە کە تواناو هێزێکی گەورەی تێدایێ . ئەو پاڵپێوەنەرانە زۆرن پاڵی پێوە دەنێن زۆرن . خاوەن هەستێکی ناسکە . لەگەڵ ئەمانەیدا ئەو بەهرەو توانایەی تیا شك نابرێ کە رووبەرووی جیهانی بکاتەوە .

ئەوەی هەیەتی خەونی رۆمانسی‌و ئارەزوویەکی راستە . ئەمانە رەنگە لە کۆتایی‌دا ببنە چەکێکی کاریگەر ، رەنگیشە ئێما سەرکەوتن وەدەستبێنێ‌و رێگای خۆی بدۆزێتەوەو چارەنووسی خۆی دیاری‌بکات .

بەڵام لەلایەکی‌ترەوە لەنێو سنورێکی داخراودایەو هیچ دەرگایەکی بۆ واڵا نەکراوە ، لە هەموو لایەکەوە دەست وەبینەقاقایا دەنرێ‌و جڵەوی توند دەکات‌و هەل‌و مەرجی دەربازبوونی لەدەست‌دەبات .

هەرچۆنێ بێ شانۆگەریەکە دەستی‌پێ‌کرد ، ئێما شووی‌کردو رووبەرووی چارەنووسی خۆی دەبێ ، بەم جۆرە کێشەکە روون دەبێتەوە ، شانۆگەریەکە جۆرە بەرەنگاربوونەوەیەکی تێدایە بریتییە : لەدوو ئارەزووی دژ بەیەك ، رووداوێك دوو رێبازی هەیە . بەم پێیە مدام بوڤاری بەرگی دراما لەبەردەکات . شتێکی ئاشکرایە گرنگی نەدراوە بە رووداوە بچکۆلەکانی سەرتاپای ژیانی ئێما . رەنگە چەند هەنگاوی چیرۆکی درامایێ . بەڵام لەو جۆرانە نییە کە فلوبیر چارەسەری‌دەکات. فلوبیر بەئاشکرا ئەوە دەردەخات : لێ‌روانینی نەخستۆتەسەر نوچدانەکانی ئیما با هەر ئەنجامێکی‌دایێ . ئەوەی ئیما پێ‌ی هەڵدەسێ یاخود تیایدا سەرناکەوێت رووداوێکی لاوەکی‌یەو ئەو نرخەی نییە .

گەشتەکەی لەگەڵ رودولف‌و لیون‌دا ،

وێنەیەکی راگوزارەو هیچ نرخێکی ئەوتۆی نییە ، روداوەکانیش بەرەو هیچ پۆپەیەك نابات بۆ وێنە : رودولف پشتی تێدەکات هیچ دیمەنێکی درامای تێدا نییە ، بەڵکو یەکێك لەو چورتومانەیە کە تووشیدەبێ .

بەڵام وەکو دیمەنێکی زەق لە کتێبەکەدا دەرناکەوێ یاخود نەبوەتە هۆی گۆڕانی رووداوەکانو بەرەو پۆپەیان نابات .

« ئیما » دوای چارەنووسی خۆی دەکەوێو مێژووی خۆی بەجێ دێڵ بەڵام فلوبیر لەمەدا هیچی دەستناکەوێتو هیچ نرخێکی درامای تێدا نییە .

ئەگەر بێتو ناوی کتێبەکە بێتەناوەوە کی زنجیرە رووداوەکان وەبیردەخاتەوە . لە راستیدا هیچکام لە رووداوەکان بەتەنها شتێك ناگەیەنێ لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانرێ دەستبەرداری هیچ کام لە رووداوەکان ببین .

« ئیما » دەیتوانی تابۆی بکرێ گەلکی لە هەڵەکان وەربگردایە بەڵام ئەو هەڵانە هیچ پێویست ناکات لەشێوەی لیون رودولف خۆی بخاتەروو . خەڵکی‌کەی دەبینیەوە گەر بهاتیایە لیون لەبەر دەستدا نەبوایە . بۆیە ئەو روداوەو گەشتانەیان بۆ « روبن » دەرەخساو سواربوونی ئەسپ لە جەنگەڵەکاندا ئەمانە کە ئیما پێی هەستاوە رێبازێکی تایبەتی فلوبیرە بۆ گێڕانەوەی بابەتەکەیو وای لێبکات شایانی سەرنج دانو تێرامان بێت .

تەنها ئەمانە هەموو ئەو شتانە نین کە فلوبیر دەبێ بیلێ :

من وای دادەنێم : رۆمانی مدام بۆڤاری ، وەکو ئەوجورەی بەسەردا هات ، سەرەرای ئەوەی جۆرێکە لە دراما ، لەبەر ئەو وێنە شاراوەیەیە هەڵبژێرراوە لەگەڵ ئەو کارتێکردنە کە وەدەستی هێناوە لەژیانی کەسە تایبەتییەکان .

رەنگیشە رومانەکە کارتێکردنێکی تێدابێ کە بریتیە لە ململانێو زورانبازی : رەوشتو ئارەزوو ، لەنێوان ئەو ململانییەوە پیاوانو ئافرەتانی هەوڵی بەدەستهێنانی بابەتەکە دەدەنو کردارەکانیانیش بێتە مایەی سەرنج راکێشان . دەتوانین بڵێین دەبێتە درامایەك لەشێوەی « جین ایر » کە لیرەشدا ئافرەتێکی کەی وەکو « ئیما » رۆڵی تایبەتی خۆی هەیە . ئەو بارەی فلوبیر رۆمانەکەی تێدا دارشتووە بەشێوەیەکی تری خۆی دەنوێنێ دراما نییە وەکو ئەوەی « تصویری »بە وەنە لە ناستێکدان .

بابەتی رۆمانەکەش لە کەسایەتی « ئیمادا » نییە ، بەشێوەیەکی تایبەتیتر کردویەتیە کەسێکی سەرەکی دراماکە : ئافرەتێکی بێدەسەڵات بە جۆرێك توانای پشتگیری کردنی ئەو بابەخەی نییە . کە راستەوخۆ پشت بە کردەوەکانیەوە دەبەستێ ، بەڵام کاتی گرنگ پێدانەکە دەکەوێتە سەر راستی ئەم ئافرەتەوە لێرەدا دەبێتە کارێکی جیاواز ، ئەو بێنرخیەی دەبێتە نرخێکی راستەقینە ، چونکی دەکرێ ئەم وێنەیە ببێتە وێنەیەکی پرشنگدار بەمەرجێ هیچ گرانییەکی تری نەخاتە سەر .

« ئیما » توانای هەست بە ژیانکردنی دەبێ، سەرەرای ئەوەی کە ناتوانێ ببێتە دروستکەری کە لێشت کە چیرۆکەکەی لێ‌پێك‌هاتووە .

کۆتایی چیرۆکەکەش لە لێدانی کوتوپری کۆتاییەکەدایە ، لەو گاڵتە پێکردنەدا دەردەکەوێ بۆ پیاو کە ئاورێ بۆرابوردوو دەداتەوە شارلس دەبێ جڵەوی خۆیبگرێ ئەمە لە لاپەرەکانی دواییدا دەبێ سووترێ . پۆپەی دراماکەش کە دەگەینە ئێرە هەستیپێدەکەین .

وە بەوجورە ژیانی رابوردوویو ئەو روداوانەی لە لاویتیدا گوزەریان کردووە تادەگاتە « ایما » بۆمان روون دەبێتەوە . بەم جۆرەش رێبازی فلوبیرمان بۆ روون دەبێتە کە چۆن لە دەوری بابەتەکە دەخولێتەوە .

**مدام بوفاری رومانێکی پتەووگونجاوە هەموو کاتیکیشی ئەممان بیستووە . وە کە جارێکی‌کەش دەیخوێنینەوە باشتر ئەممان لا روون دەبێتەوە .**

— الاقلام : ژ ١١ ، ١٩٨٠

# سۆز

شێرکۆ بێکەس



\- ١ -

دڵت هەرێمێکی ساردەو ،
دوورگەیەکی تەریکەو دوور
بەم شەوە من : ڕێم کەوتۆتە ،
ناو ئەم دارستانی بەفرەو
بەرەو لای تۆ ..
ئەم کوێستانی نامۆییەم
گرتۆتە بەر .
هەنگاو
هەنگاو

بە سەر لەشی
سپیو ڕەشی ڕەووزنی
ئەم شەوەدا تێئەپەڕم .
هیچ دیار نییە ..
نەگری چاوانی ژوورو
نە ترووسکەی چرای بەرماڵ
هیچ دیار نییە ..
تەنها هەر خۆم
پشکۆی سووری

ناو ئەم بەفرو شەختەلانەم
« با »ی هەڵکردووی
گڤە تەزیو
نەمگەشێنێتەوەو .. نەڕۆم
قیبلەنیمام : ئەو سۆزەیە
کە لە کۆچی عەشقی تۆدا

خوا پێیبەخشیم .
« ئەی خوای ڕەوەندە نامۆکان
ئەی کۆچەرە مەزنەکەی ،
سەر قافڵەی خەمی یاران
پەنجەی نوورت ئاماژەکەو
بیخەرە سەر ناوچەوانی ،
هەرێمی سارد .
قژی ئەستێرە گرتووی خۆت

بنالێنە لەم شەوەوە
با هەڵگیرسێ

دوورگەی تەریکو ، چراخان :
ڕووناکی کا هەیوانو ژوور
ماڵی تاریک . »

- ٢ -

بەدوای کۆچتا
من شیعرێکی لانەوازی
ڕەشو ڕووتبووم
لە باوەشتا هەڵئەلەرزیم
ساوا بوومو دار بەدەستیش .
بەدوای کۆچتا
من شۆڕە بی غەمگینی سەر :
کەنارت بووم
کە ئەگریام هاژەت لەگەڵما ئەگریا
ئەبووین بەیەک .
هەموو گۆیکەکانم چاو بوون
ئەوەی من دیم
چاوی « مەولانا » دیویەتیو
کەسی دی نا !
گەڵاکانم هەمووی گوێ بوون
ئەوەی بیستم ،
هەر گوێی « مەولانا » بیستویەتیو
کەسی دی نا !
بەدوای کۆچتا ،
هەر ئەستێرەی نیگا تەڕبوو
هۆن هۆن جریوەیان ئەڕشت
لە ئاسمانا
من جریوەی چاوم ئەسڕیو
لە زەویشدا
شوێن پێی هەتاوم هەڵئەگرت .
ئەی کۆچەرە مەزنەکەی
سەر قافڵەی خەمی یاران
چاو هی خۆتە
ناخ هی خۆتە
لەناو تۆدا .. من ئیستاکە
تول خەندەرانی بەیانیم
تۆ بڕوانە ..
زەردەخەنەم بەڵام .. ئەگرییم !

- ٣ -

بە سۆزی تۆوە بانگ ئەدەم
من تەنیامو .. کاروانیشم
زیندانیمو .. ئازادیشم
باڵدارنیمو لەناو هەورام
تەنها ساتێ
جێنزرکەی خۆشەویستیی
تۆم جێنەهێشت
کەچی دنیاش
هەمووی گەڕام .

- ٤ -

ئەی کۆچەرە مەزنەکەی
سەر قافڵەی خەمی یاران
تا ئەوینت ئابلووقەی گیانی نەدابووم
سەربەست نەبووم .
تا لە چاوتا نوقم نەبووم
باران لەدڵما دای نەکرد .
تا نەچوومە مەشخەڵانی
ناو ڕۆحتەوە
نەبوومە تیشک
تابۆی هەناسەتم نەکرد
نەبوومە « با »و هەڵمنەکرد .
کە لێوم نا بە سەرچاوەی بنارتەوە
بوومە شەپۆلی ئەسرەوتی
بێ بێقەرار
کە چریکەت ڕای چەنانم
بوومەلەرزەم خستە پێش خۆم
لەو دەمەوە ..
« حاڵ » گرتوومیو
وەک ئاگری بەر زریانێ
لە لووتکەتا
پەلوپۆی کڵپە ئەهاوم
بۆ دێ بە دێ
بۆ شار بە شار
لەو دەمەوە
من تەوێلی ئەم گەردوونە
ئەخوێنمەوە ..
لەو دەمەوە
من بوومەتە شاری گەورەی
عیشقو ئازار .

# له دەفتەری شیعرەوە

د. عزالدین مصطفى رسول

**هەندێك‌جار نازارو هەستی پەنگەوە خواردووی دەروون بەشتێکی وەك شیعر خۆی دەردەبڕێ . لەوچەشنە دەربڕینە کە زوربەیان لەدوور وولاتی‌ی چەندجارەدا سەریان هەڵهێناوە ، یا زادەی زامێکی دەروونن زۆر کۆبوونەتەوە . هەنێکیان لە دووتوێی کتێبی « رازی دووری »دا جێ‌یان بۆوە ، وا بەرەبەرە بەشێکی تریان کە بەلای خۆمەوە کەلکی بلاوکردنەوەیان هەیە ، بەرەو لاپەڕەی گۆڤارەکانمان دەچن .**

**ڕادەی ئەم شیعرانە چەند بینو نەبن ، ئەوەندەیان تێدایە کە بەری هەژینی دەروونن ، با نەشتوانن بمبەنە ڕیزو ناو شاعیران .**

**« ع. م. ر »**

## بۆ مەرگی « ن. ناری »

من بیستبووم پایز لای کورد ناوی خەزان‌بوو
گەلاڕێزان ، دووا ڕۆژانی گەشەی داران‌بوو
چالی تاریك چاوەڕوانی کاروانی با بوو
بۆ گەلای زەرد ، سیسەوە بوو ، تینووی باران‌بوو
تا دایپۆشی‌و بۆ ئەوکەسە خەستکا قوڕی شین
کە جێی ناوی دووا دێڕەکەی دەفتەری ژیان‌بوو

* * *

من بیستبووم پایز لای‌کورد وێنەی ماتەم‌بوو
بۆ شاعیران قیبلەی شین‌و گریەو فیغان‌بوو
ئەی پایزی دڵی شاعیر ، خەزانەکەی کورد
جاروباریش گەلای زەردی دیمەنی جوان‌بوو
پایزی غەم لەگەڵ لێوی چالی تاریکا
زەردەی دەم‌کەل ، قژ زەردەکەی شیعری گۆران‌بوو
ئەی پایزی دڵی پیربووی ، گەنجێتی‌ی زامم
خەزانی کورد ، ئەم تشرینەش بۆمن گریان‌بوو
پاش چەند ساڵەی دووریی دڵو تاسەی غەریبی
پایزی دڵ ، دیاریی بۆ من گەلاڕێزان‌بوو

**سلێمانی - ١٩٦٨**

## ● مۆم ●

هەزار ساڵە ، گوڵ هەر گوڵەو
بولبول شێتەو بۆ گوڵ ئەگری
هەزار ساڵە مۆمی کافوور
دەتوێتەوەو پەروانەش
ئەبەخشێ پێ‌ی پەڕی
من نامەوێ ئەوگوڵەبم
هیچ بولبولێ بۆ من شێت‌بێ
من نامەوێ ئەو مۆمەبم
دڵم بەردەباری ڕێت‌بێ
دەبا من هەر پەروانەبم
بۆ گڕێ‌مۆم گیان‌فیدابم

**مۆسکو - ١٩٧٧**



## ● شـــــيعرم ●

شەوەی(١) چنک ڕەش شیعری کوشتم
ئەمڕۆ بادەی نەشئەی ڕشـــتم
شیعری ئەمڕۆم نازدارێك بوو
شیعری ئەمڕۆم غەمدارێك‌بوو
خەمی چەند ساڵەمی پێ‌بوو
هێلانەی دڵ ، دەمێك ساڵ‌بوو
بۆ ئەو جێ‌بوو
کەهات‌و دەمی هەڵهێنا
سەری لە زوڵمەت دەرهێنا(٢)
خەم‌بوو ، بورکانێکی پێ‌بوو
لە ووشەکانێکی پێ‌بوو
کانی سۆز(٣)و نەقشی بەردبوو
دەردی دڵێکی بێ‌گەرد بوو
هاوڕێی ئازاری مەردان‌بوو
دڵی دەروێشی گەڕیدەی
شار بەشاری گشت جیهان‌بوو
کەشکۆڵی(٤) بوو ، لە شیعر پڕبوو
باڵداری جەنگەڵێکی چڕبوو
سەرگوزەشتەی زۆری لابوو
کاتێ لەدووا هێلانە ڕابوو(٥)
زریقوباق ، پڕکات جیهان
پەندێ جێ‌بێڵێ بۆدەوران
ژیریی پیرو دڵی منداڵ
ببنە پەیکەر ..
بۆ خەمی من ، خەمی چەند ساڵ
ئەوسا ( شەوە )ی چنک‌ڕەش خۆی نواند
( دایکی ئاڵ )(٦)ی بەمەرگ بەزاند
منی جێ‌هێشت ، شیعری کوشتم
بادەی نەشـــــئەی ئەمڕۆی ڕشتم

**بەغدا ١٩٨٠/٦/٦**

**(١) شەوە ـ لە ئەفســـــانەی کوردیدا ئـــەو جنۆکـــەیە یەکـــە منداڵی تازە لەدایك‌بوو دەکوژێت .**

**(٢) واتـــە : هاتە دنیاوە .**

**(٣) ســـــــۆز : بە کوردی سۆزی دەروونە ، بەتورکی ( قســـەو پەیمانە ) دەگەیێنێت ، لەنـــاو کوردی ژووررووشدا بەمـــانای دووەم بەکـــاردێت . لێرەدا دەتوانین هـــەردوو ماناکەمان مەبەست بێ .**

**(٤) کەشکۆڵی دەروێش ، کە هەموو جۆرەشتێکی تێدایەو کەشکۆڵی شیعری هەمەڕەنگە .**

**(٥) ڕابوو : هەستا .**

**(٦) دایکی ئاڵ : لە ئەفسانەی کوردیدا ، ئـەو جنۆکەیەیە کە ژنی زەیستان ، واتە دایکی منداڵەکە دەکوژێت‌و منداڵ بێ‌دایك دەکات. ئەم پێچەوانەی ( شەوە )یە .**

زۆرجار سێبەرێکی گران دەکەوێتە سەرشانت ، ماتیو خەمێکی قورس دات دەگرێت ، لە سەرەتاوە سێبەرەکە تەنکە ، پاشانی تەواو خەست دەبێتەوەو ئەنجا بە هەموو لەشتا دادەچۆڕێت . ئەهۆسەرەکیەکەی دەزانیتو نەدەیشزانیت لە کوێوەکەی دەست پێدەکات ! رەنگە زۆر خواردنەوەی شەوی پێشوو ، یان بینینی دەموچاوێکی نەگریس بێت کە ئەو ڕۆژە لە بازاڕدا لووتت بە لووتیەوە تەقیوە . یان وەك - دۆستۆیڤسکی - دەڵیت . کەوتنی دەستەسڕێك لە سەر زەوی ، لە بیرچوونی دانانی کتێبێك لە کتێبخانەدا بنەهۆ . بەڵام ئەمانە هیچیان نین ، بینینی دەموچاوی پشیلەیەکی سپلەکەی ئەو بارەگرانە دێنێت ! یان کەوتنی دەستەسڕو لە یادنەردنی کتێبێك !. کە ئەو مۆتەکەیەت دێتە سەرشان هەست بە تەریکە دنیایی دەکەیت ، لقی براوەی درەختێکیت ، نەئاگات لەقسەی دەوروبەرتەو نە بۆ کەسیش دێتە وەلام ، ئەوەیش دەیەوێت بتدوێنێت - ئەگەر دان بە خوتدانەگرێت - حەز - دەکەیت هەلکوتیتە سەریو ملیهەڵبکێشیت ، یان هەر هیچ نەبێت تۆپەوانەیەك بناخنیتە دەمیەوە .

ئەگەرچی مۆتەکەیەکی گەلێك قورسە ، کەچی تامیشی لێوەردەگرێت . چێژ دەداتە هەموو دەمارەکانی لەشت ، لە ڕاستیا چێژی ئازارە ، بەلام خۆشە ، لەو شەپۆلە شێتانە دەچێت کە مەلەوانێکی تەواو ماندوو بەرەو کەنار رادەدەنو ئەویش شلو کەم جوولەیە . لەڕاستیا تۆ بۆ هۆی سەرەکی دەچیت ، بەلام جاری وا هەیە ئەوپشت لێ دەئالۆزێت ، چونکە پاشان کە بە حالەتەکەتدا دەچیتەوە گومانێك پەیدا دەکەیت ، هەرچۆنێك بێت دیسان دێیتەوە سەر ئەو هۆیە ، چونکە لەویان بەهێزتر تیا نیە . ڕەنگە دوو حالەتیش تێکەلی یەك بکەیت : یەکەمیان ئەو - ماتی - یەی کە باست کرد ، دووەمیان ئالۆزیەکی مێشکتە ، تۆ ئەمیانت زیاتر مەبەستە ، ئەو کاتانەی بەڕوالەت بێدەنگو ماتی ، کەچی لەناوەوەتدا دەکولێیت . هەست بە تاوانباری دەکەیت ، تاوانێك وەك گازدەمارەکانی لەشت ڕیشەکێش دەکەن ، حەز بە هاوارێك دەکەیت پڕ بە پڕی گەرووت ، یان یەکێك هەبێت دەرگای دلتی بۆ بخەیتە سەرپشت ، ڕاستیی بۆ بدرکێنیت ، ئەیش زانیت ئەمەت زۆر لەسەر دەکەوێت ، چونکە خاوەن کۆمەلێك منداڵیت ، ژنەکەت گەنجو جوانە ، پایەیەکی باشی کۆمەلایەتیت هەیە ، هەموو کەسێك ڕێزتلێدەگرێت . ئەی ئەگەر کەوتە هەلڕشتنی نهێنیەکەت چیت بۆ دەمێنێتەوە ؟ منداڵەکانت بە چاوی سووك لێت دەڕوانن‌و ژنەکەت حاشاتلێدەکات ، کۆمەلیش وەك سەلکە تووڕێکی ڕزیو دەت هاوێژێتە تەنەکەی خۆلەوە . دەیشزانیت ئەگەر دان بە تاوانەکەتدا بنێیت باری لەشت سووك دەبێت ، مێشکت دەحەسێتەوە ، ئەی چیدەکەیت ؟ تەوژمێك دێتە سەر ویژدانت ، خەوی شەوت لە چاودەبڕێتو ڕۆژت لێدەکاتە دۆزەخ .

# ئەو پیاوەی کەس نەبوو گوێی لێ بگرێت .

**( دان بەتاوانەتەتدا بنێ ، ژیانت دەبێتە بەهەشت ) .**

**( ئەگەر ئەمەبکەیت ژنو منداڵو خەڵکیت لەکیس‌دەچێت ، دەستوپێت بەکۆتەوە دەئاڵێت ، نەکەی ... نەکەی .. ) .**

**زیاد لە دە ساڵە تۆ بەم ئازارەوە دەتلێیتەوە، ژنو منداڵەکانیشت هەستیان پێ‌کردووە ، شارەزای مۆتەکەکەی سەرشانت بوون ، ژنەکەت سادەیە ، وا دەزانێت پێش ئەو ئافرەتی‌ترت خۆش وستووەو ئێستا بیر لەوە دەکەیتەوە ، زۆرجار تەمانی‌و بێ‌دەنگیەتەمت زۆرلی خایاندوە هاتۆتە لاتەوەو پێی وتوویت :**

— پێش من دلت بەکێ داوە ، ئەی بۆ ئەوت نەهێنا ؟

**تۆ ئەوەندەی‌تر باری‌گرانی لەشت زیاد دەکات ، بەرقەوەتیلەی چاوێکی دەدەیتێ ، ڕق دەت کرۆژێت ، لەو کاتانەدا حەزبەوەدەکەیت لە ناکا پڕ بدەیتە بەردێك دارێك پارچە ئاسنێكو بکەویتە وێزەی خۆت ، ئەوەندە بە سەروپۆتەلاکی خۆتدا بکێشیت تابێ هۆش دەکەویت ، بەلام ناچار خۆت دەخۆیتەوە ، ئارام دەگریتو بێ‌وەلام لێی دەگەڕێیت . هەندێك جاریش بەسەرتا هاتووە بێ سێ‌ودوو ڕاستیەکەیان پێ‌بلێیت بەلام ستەمە لە چاوتروکانێکدا فرشتەیەك لای منداڵەکانی ببێتە گورگ .**

وەك ووتت ئەم ماتەمیە کاتو شوێنی تایبەتی نیە ، لە شەقامی گشتیدا ، لەناو بازاڕی جەنجاڵدا ، لە تەنیایی‌و هێوری خۆتدا تووشت دێت . گەلێك کەس کەناسیاون‌و بەلاتدا تێ‌دەپەڕن هەستیان پێ‌نانەیت ، هەنگاو دەنێیت بەلام ئاگادارنیت ، زیاتر لە مرۆڤێکی ئالی دەچیت ، چاوت دەسووڕێتو کەم کەس دەناسێت . کە هەندێك دەستی ڕێزت بۆ بەسنگەوە دەگرن تەریق دەبیتەوە ، ئارەقی شەرمەزاری دەکەوێتە ناو چاوت . شتێکیش ڕێگای ئەوەت لێ‌دەگرێت کە بەرۆکیان بگریتو پێیان بلێیت : گەلۆرینە ، کەرینە ، ئێوە ڕێزی من بۆ دەگرن ؟ جێگای من سەر زبڵ‌خانەو شوێنە پووچەکانە ، بۆ نام خوێننەوە ؟ من تاوانبارم ، نەزانن تاوانباریانی چی ؟ ئەو کەسەی ڕاستیەکی لایەو نەیشارێتەوە ، تاوانێکی کردوەو پێی لێ‌نانێت .

ڕۆژێك کە هاتیەوە ماڵێ کوڕەگەورەکەت تازە لە قوتابخانە گەڕابوەوە پێی ووتیت :

**— باوکە .. زۆرکەس هەیە گەلێك تۆیان خۆش دەوێت .**

وەك لەزووەوە چاوەڕێی مەبەستێکی وابیتو ، وەلامەکەیش بەسەر زمانتەوە بێت



کوت‌وپڕ پێت ووت :

— **چونکه ئەوانه گەمژەن .**

کوڕەکەت پێ‌کەنی ، هەربەدەم پێکەنینەکەیەوە ووتی :

— **مەبەستت ئەوەیە عاقڵن .**

— **نەخێر .. بەسەری تۆ ، بەسەری باوکی تۆیش ڕاستت پێ‌دەڵێم ، ئەوانه گەمژەو کەلۆرن .**

ئەمجارەیان دایه قاقا ، تۆ ئالۆزایت ، مێشکت کەوتەوە ژاروژەنگ ، ویستت پێی بلێیت : ئەو کوڕی تاوانبارێکی گەورەیە ، ئەگەر کرۆمۆسۆماتەکان ڕاستبکەن ئەویش دەبێته بێچووە گورگ ، بەلام شتێك دەمی‌گرتی ، نازانیت چی‌بوو ، تەنیا ئەوەندە دەزانیت که ئەبوو بیلێیت‌و نەت وت .

هالەتەکه وەك خۆرە داوبەته لەشت ، پووکاویتەوە ، هەست به مەرگێکی نزیك دەکەیت ، ئەو مردنه ناوەختە ئاسوودەیی ئەوەت دەداتێ بەشێك لەتاوانەکەت دەشواتەوە ، زورجار بەخۆت دەلێیت ؛ ( ئەگەر مەسەلەکە تەمەن بێت بۆ مردن زۆرم ماوە ، هێشتا گەنجم ، ئەم مەرگه نوت‌وپڕەی هەموو ڕۆژێك له چاوەڕوانیمدایه هۆیەکەی نهێنیەکەمە ، واتا ئەگەر من ئەو تاوانەم نەکردایه ئێستا پیاوێکی تەواو لەش ساغ‌و پڕبووم ، کەچی دەغەزارو کەنەفتم ، کەواته باجێکی تاوانەکەم داوە ، هۆی ئەوەڵ‌و ئاخری مردنیشم هەر ئەوەیە . بەلام گشت تاوانبارێك وەك خەلکی‌تر دەمرێت ، له مەرگ دادپەروەرتریش نیه ، که واته ئەم پاساوەی من خۆ هەلخەلەتاندنه ) .

ڕۆژێك چوویته لای هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستت ، پێت ووت :

— **من دە ساڵ لەمەوبەر تاوانێکم کردووە ، تۆ یەکەم کەسیت لات بدرکێنم ، نهێنێ ئەو تاوانه خستوومیەتە دۆزەخی ئازارەوە ، تاڵ تاڵ دەمارەکانی مێشکم هەلئەقرچێن .**

هاوڕێکەت دایه قاقای پێکەنین‌و ووتی :

— **شەوچیت خواردووە ؟**

پرسیارەکەیت زۆر بەلاوە سەیربوو ، پێت ووت :

— **مەبەستت چیه ؟**

— **خەوبینینی شەو پەیوەندی بەخواردنی ئێوارەوەیه ، دیارمزۆرت خواردووە ، ڕەنگە خواردبێتشتەوە !**

— **جا من کەی باسی خەوو خواردنم لاکردوویت ؟**

— **ئەی ئەم ووڕێنانه چیه ئەیکەیت ؟ شێت بوویت ؟**

دەلێی نه من دەناسیت‌و نه خۆت :

— **بۆ ووڕێنەیە ؟ بۆ ئەگەر ڕاستیەك بدرکێنم شێتم ؟**

من پانزە ساله هاوڕێی تۆم ، تۆ سالاری کوڕی ئەحمەدی کوڕی رەشیدیت ، سێ کوڕو کچێکت هەیە ، کە - پەروانە - ی ژنت هێنا من سەد دینارم داپێ . منیش ڕەزای کوڕی عەزیزی کوڕی مەجیدم ، ژنەکەم ناوی - نەسرین -ە ، دوو کوڕو دوو کچم هەیە ، وەك تۆ لە دایەرەیەکدا مووچەخۆرم ، تەمەنم چل ساله ، ئەم بەیانیه نان‌و پەنیرم له مالەوە خواردووەو دوێنێ نیوەڕۆیش تەزاتەممان هەبوو ، من تەواو هوشیارم‌و ئاگام له خۆمە ، بە قەدەر نووکەدەرزیەکێش ناتەواوی له مێشکمدانیه ، نازانم چی‌ترت دەوێت تابۆت باس بکەم ، ئێستایش هەر بەشێتم دەزانیت ؟! بڕوام پێ بکە تاوانێکم کردووە ، ئەگەر گوێم لێ‌دەگریت لەسەرەتاوە بۆت دەگێڕمەوە ، پاشان وەك پیاو ڕێگایەکم بۆ داپنێ .

هاوڕێکەت زۆر بەهێمنی گوێی لێ‌گرتبوویت ، که لێ‌بوویتەوە کەمێك ڕاما ، دلت خۆش‌بوو ، تەواو خۆت ئامادەکرد ، بەلام پاش ئەوەی هاوڕێکەت پەنجەی له لاجانگی کردەوە ، بەدەم هەناسەیەکەوە که مانای خەم‌ونیگەرانی دەبەخشی لەسەرخۆ پێی ووتیت :

— **کاکه ڕەمزا .. بەقسەی برا بچووکی خۆت بکە ، بچوورەلای پزیشکێکی دەروونی ، بەلام ئاگات‌لێ‌بێت .. تۆکە ئەوەندە تاوانبارێکی زل‌و ناوداریت پزیشکەکەیش نەکوژیت .. ها ..!**

بەپێکەنین و تەوس لێدانەوە هەستاوپشتی لێ هەلکردیت . لەو کاتەدا نەتدەزانی بەزەیت بەودابێتەوە یان خۆت . چونکە لەوە دلنیا بوویت کە لەگەل کابرایەکی بێمێشک و کەردا دوایت . ئەی تۆیش گەلۆرنییت کە بێ ئەوەی کەس زانیبێتی جاری تاوانباری خۆت دەدەیت ! بەلام ئەمە لەدەست تۆدانیە ، کێ حەز بەکوێری خۆی دەکات ؟ تۆ دەزانیت لەناو ئەم کۆمەلەدا دەیانی وەك خۆتی تیایە ، وەلێ تۆ لەتاوانی خەلکیەوە سەیری پیاو چاکی خۆت ناکەیت ، تۆ لە یاسای سروشت لات داوە ، کەواتە هەقتە هەست بەتاوانباریت بکەیت ، ئەوانەی پێنازانن ئاژەلن ، یان تاسەریان نێشتوتە تاوانی ترەوە ، ئیتر هەست بەچی بکەن ! وەنگە پێش یەکەمجاریان مرۆڤێکی گەلێك ئاسایی و رەوشت بەرزبووبن ، بەلام یەکەم هەلخلیسکان و بەس ، هەندێك ئەیداتە دەمی ، تا ئەمەندەی لە سەرکەلەکە دەبێت جێی پاکی و جوامێری بۆ نامێنێتەوە . هەبشە هەستی پێدەکات ، دەزانێت بارەکەی چەندە قورسە ، کەچی حەزدەکات هەموو خەلکی دی وەك ئەویان لێبێت ، ڕەنگە ئەمە لە نەستیاندا بنجی داکوتابێت و نەیشزانن بۆچی ! مرۆڤی وەك تۆیش هەیە ، بارەکە هەموو بەسەر شانی خۆیەوەیەتی ، هەر رۆژێکی مردنێکە ، سەیر ئەوەیە خەلکی زۆری لاخۆشە پیاوی مەزن عەیبەی بێتە سەر ، لەکەیەك بکەوێتە سەر ژیانی ، کەچی لەم بارەی تۆدا کە خۆت هاوارت لێهەستاوەو دانی پیادەنێیت کەس نیە گوێت لێبگرێت ، کەواتە حالەتەکە تابێت گرێی زیاتری تێدەکەوێت ، هەندێك جار گریان دەکەیتە دوایەنات ، فرمێسکەکان بەگەرمی دەتکێنە سەر ڕوومەتت . تۆ بڕوات بەهیچ هێزێکی دەرەوەی سروشت نیە ، کەچی لەو کاتانەداو بێئەوەی بزانیت بۆچی سەرت بەرز دەکەیتەوە ، داوای ئاسوودەیی و لێبووردن لە خوادەکەیت ، دەپاڕێیتەوە ، هەست دەکەیت دەستێکی زۆر بەهێز بەرەو دۆزەخەکەی خوات کێش دەکات ، بڕوایش ناکەیت دەستی تاقە پیاو چاکێك هەبێت بتگاتێ ، رزگار بوونت مەحالە ، تەنیا دلە گەورەکەی خواماوە لێت خۆش بێت ، بەزەیی ئەو بێمانەندو لێبووردنی فراوانە . بەلام ناتوانیت تەنیا بە تۆلەی خوا دلنیا بیت ، ئەمەیان هەقێکی ترە ، ئەی ئەوەی ویژدانت داوات لێدەکات چی لا پێویستە تا لە ژیاندا ماویت هەموو شتێك بلێیت ، خەلکی ڕاستیی تۆ بزانن ، بۆ ئەوەی ویژدانت ئاسوودە بێت .

لەسەری شەقامەکەدا وەستایت و هاوارت کرد :

**( خەلکینە .. گوێم لێبگرن ، دە سال لەمەوبەر تاوانێکم کردووە ، ئێستا دەمەوێت پەردەی لەسەر لابدەم ، گوێم بۆ بگرن .. ) .**

نەیانهێشت هیچی تر بلێیت ، لەپڕا دەمت گیرا ، لەچاوتروکانێکدا هەلگیرایت و فڕێ درایتە ناو ئۆتۆمبێلێکەوە ، وازت نەهێنا ، هەر کە دەستیان لەدەمت کردەوە هاوارت لێ هەلسایەوە:
**( کورە بۆ خوا گوێم لێرابگرن ، تاوانەکە گەلێك گرانە ، وەك من کار لە ئێوەیش دەکات و دەکەونە گریان .. ) .**

ئەمجارە دەمیان بەستی ، هەر دوو دەسیشت لە دواوە شەتەك درا ، ئەوان لەگەل یەکترا کەوتنە گفتوگۆ :

**— ئەمە کەی وای لێهاتووە ، لای خۆی لەپیاوە دیارەکانی شاربوو !**

**— مرۆڤ بەرگەی چیدەگرێت ؟ ئەمرۆ چاکەو سبەینێ دەستی ئەوانی لێدەوەشێت .**

**— منیش باپیرم لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیا وای لێهاتبوو ، باوکم ووتی : ئێوارە سپ وساغبوو ، کە تاریك داهات چووە دەرێ و لەو سەرەوە بەشێتی گەڕایەوە .**

زۆر بە پەرۆشەوە گوێت هەلخستبوو ، چاویشت وەك هەلماتە شووشە لە نێوانیاندا یاری دەکرد ، نەت دەزانی پێبکەنیت یان بگریت ، بەلام زیاد لەهەر ڕاستیەکی تر لەوە دلنیا بوویت کە چەند کەسێکی شێت و نەفام مرۆڤێکی تەواو هوشیاریان داوەتە بەر .

ئێستایش وا هەفتەیەکە لە نەخۆشخانە کەوتوویت ، هەموو رۆژێك سەرت لە کارەبا دەدەن ، لە هەموو ناخۆشی و گرانتریش ئەوەیە نە تۆ لە پزیشکەکەت دەگەیت و نە ئەویش گوێت لێ ڕادەگرێت .

# تۆڵە

چیرۆکی : عومەر سەیفەددین
ئەحمەد تاقانە
لە تورکییەوە وەرگێڕاوە

لەو دووکانەیدا کە جگە لە دەرگا تەسکەکەی بواری ڕووناکی چوونە ژوورەوەی دیی نەبوو ، بەتەنیا ، شەوو ڕۆژ عەلییە پیرە ، بەدەم پریشك پڕژاندنەوەوە ناری دەکرد ، کوتومت شێرێکی فەفەس‌نیشتەی ڕەووشت چانی دەنواند .

پالەوانێکی بالا بەرز ، چنگ درشت ، بازوو ئەستوورو شان بەرین بوو . ئەو تیغە شمشێرانەی وا دە ساڵ بوو لەناو ئەم ئەشکەوتەدا لەئاسنی خاوی دروست دەکردن ، لە هەموو ئەنەدۆڵو ڕوومێلیو سەرتاسەری سنوورەکاندا ناوبانگیان دەرکردبوو . تەنانەت لە ئەستەمبوولیشدا یەنیچەرییەکان لەسەر تیغی قمەو سالدرمە یەتەغانەکاندا ، لەمۆری « وەستا عەلی » دەگەڕان .. هەرخۆی دەیزانی چۆن شیشە خاوەکان دووجاران زاخاو بدات .

نەك هەر شمشێری درێژ ، تەنانەت ئەو چەقۆ کورتانەش کە دروستی دەکردن ، دووجاران بەسەر یەکدا بنوشتێنرابایە ، دیسانەوە لەشکان نەدەهاتن . پیشەی « دووجار زاخاودان » نهێنییەك بوو تەنیاو هەر لەخۆی دەوەشایەوە .

شاگردی ڕانەدەگرت ، کەسی زۆر نەدەدواند ، لە دووکانەکەیەوە نەدەهاتە دەرێ . هەمیشە هەر خەریكبوو . ڕەبەنبوو ، خزمو خوێشی نەبوو ، بێکانەی شاربوو ، لەباسی شمشێرو ئاسنو شیشو ئاگر بەولاوە قسەی دیی نەدەزانی ، سەودای نەدەبرد ، کڕیار چەندیان بدایە وەری دەگرت . تەنیا لەکاتی جەنگدا کوورەی دەکوژاندەوەو . دەرگای دووکانەکەی کلیل دەداو ، بزردەبوو ، پاش جەنگ دەهاتەوە گۆڕێ.

لەشاردا گەلێك چیرۆکی لێدەگێڕرایەوە . هەبوون دەیانگوت : « کابرایەکە لەدەست جەللادەوە هەڵاتووە » . هەشبوو دەیگوت « نامۆیەکە ، پاش مردنی دڵخوازەکەی لەدنیای بێ‌فەڕ دوورکەوتووەتەوە » . بەچاوە ڕەشو بەرزنوارِەکانیەوەو ، بە ڕەووشت بەرزیو قسە نەستەقەکانیەوە دیاربوو کە کابرایەکی ئاسایی نییە . بەلام کێیە ؟ کوێندەرییە ؟ کوێوەهاتووە ؟ کەسێك نەبوو ئەمانە بزانێت . خەلکیش خۆشیان

دەویست . وەستایەکی وا بەناوبانگ لەشاردا ، بۆ هەرکەسەو جۆرە شانازییەك بوو ، دەیانگوت :

— **عەلیی خۆمان .**

— **پیرە وەستای لەمەڕخۆمان .**

— **لەجیهاندا هاوتای نییە .**

عەلیە پیرە ، کە ئەستوورترین و سەختترین ئاسنی وەکو کەلای میرتەنك دەکردەوە ، پیشەی کاغەز ئاسا نەرم کردنەوەی لەکەس فێر نەبووبوو ، هەر بەخۆی دۆزیبوویەوە ؟ هێشتا دوانزە ساڵان بووە ، لەملی باوکە بەگلەریەگییەکەی دراوە . هەتیو کەوتووە . مامی زۆر دەولەمەند بوو . بردیە لای خۆی . ویستی بیخاتە بەرخوێندن . بەلکو بۆ مووچەخۆریی دەولەت پێی دەگەیەنێت و بەرەو پایە بەرزەکان سەری بخات . بەلام بەلای عەلییەوە « مننەتبار بوونی بەرامبەر کەسانی دی ئازار دلۆپێن بوو » . گوتی « من بۆکەس نابم بەسوپاسگۆ » . شەوێکیان لەماڵی مامییەوە هەلهات . وەکو سەرسەرییەکی بێناوونیشان بەچیاو گردو دۆڵدا ڕەتبوو . بەشاری ئەوتۆدا گەڕا کەناوی نەدەزانین . دوایی لە ئەرزەڕۆمدا چووە لای ئاسنگەرێکی پیر . تا سێ ساڵ لە ئەنەدۆڵدا ، شارنەما سەری پێدانەکا . ملی بۆکەس کەچ نەکرد . مننەتبار نەبوو ، نانی خۆی لەبەردەوە هەڵدەتۆقاند . بەئارەقەی ناوچاوان بەدەستی دەهێنا . گەلێك کاری کرد . کاری بێوێنەی هێنایە گۆڕێ . بەقازانجی زۆرکەم قایلبوو . وەکو داهێنەرێك کە لەناخیدا « ڕووناکییەکی ئاگری پیرۆز » هەبێت .. نەك بۆ پارە ، بەلکو بۆ هەوەس و وەستایی کاری دەکرد . « دووجاران شیش زاخاودان » ئەڤینی بوو . لەو سەردەمانەدا کە دەچووە جەنگەوە ، کە گوێی لە پێدا هەلدانی کاری « وەستا عەلی » دەبوو ، هەستی بە زەوقێکی گوزاردیی ئەوتۆ دەبوو کە لە تواناداا نییە چەند هەزار سەربازێکی دی شمشێری لەشکان نەهاتوو ، بەتەغانی ئاسنینی مەتاڵ ئەنجن کەرەوەی چاك و ساڵدرمەی سەنگین و بڕندە دروست بکات . هەرچەند ئەمەی بەبیردا دەهاتەوە ، زەردەخەندەیەك دەیگرت و دلی بەتام و بۆوە لێی دەدا . بەگیان و بەدڵ ، بەهەڵمەتێکەوە ملیۆنەها شیشی لەسەر دەزگایەیدا گرتێبەردەدان و بەیەکیەوەی ئاوێتە دەکردن ..

— **تەق ..**

— **تەق ، تەق ..**

— **تەق ، تەق ..**

ئەوا ئەمڕۆش لە بەیانییەوە ، بێئەوەی پێی بکرێت پشوو بدات دەسەعات خەریكبووە ..

ئەو تییفە لارەی کە دەیکوتی ، کردەناو بەرمیلە ئاوەکەی تەك دەزگاکەیەوە .. سەیرێکی کورەکەی کرد کە خەریكبوو دادەمرکایەوە .. بەو دەستەی کە چەکوشەکەی پێدانایەوە ئارەقەی سڕییەوە.. بەرەو دەرگا وەرچەرخا .

حاجی لەقلەقەکانی هێلانەی تەپلی سەری دووکەلکێشەکە هەراو هوریایەکی نەبڕاوەیان قەوماندبوو . دەستەکانی شۆرد ، وشکی کردنەوەو چووە دەرەوە ، دەرگاکەی لەپشت خۆیەوە بەباشی ڕاکێشا ، بەپێویستی نەزانی کلیلی بدات . ڕێی کرد . خەوی نەدەهات . هاوینە شەوێکی بەئەستێرەی گەرمبوو . ڕێی کاکێشان بەزەردە ئاردە زێڕینێکەوە ، وەکو پەلە هەورێك لەلایەکی ئاسمانەوە بۆلایەکەی دی دەکشا . ڕێی کرد . لەسەر ئەو پردە تەختەیەدا وەستا کە لەڕێی بەرەو مۆلگەکانی شارەوەبوو . ئەو ئەستێرانەی کە لەبنی دۆلە بەرینەکەدا ڕەنگیان دەدایەوە ، وەکو زیخ و چەوی لەتیشك دروستکراو دەبریسکانەوە .. دەیانجریواند . لەسەر دارەبییە گردو تاریکەکانی لایەکانیدا بولبول دەیانخوێند .. ڕاما ، ڕۆی .. چەندین سەعات نەبزوا ..

دەنگێك لەپشتەوە هاواری لێکرد ..

— **کێیە ئەوە ؟**

— . . .

لەوجیهانەوە بە ئاگاهاتەوە کە تێیدا ڕامابوو .. ئاوڕی دایەوە . لەوبەری پردەوە

دووسێ تارمایی نزیك دەبوونەوە .. وەڵامی دایەوە .

— **خۆمانین ..**

— **کێیت ؟**

— **عەلی ..**

— **کام عەلی ؟**

سێبەرەکان نزیك بوونەوە .. لەدووریی هەنگاوێکەوە ، لەشێوەیەوە ناسیبیانەوە .

— **عەلییە پیرە .. عەلییە پیرە .. ئا ..**

— **...**

— **ئەوە تۆی وەستا عەلی ؟**

— **منم .**

— **لەم درەنگانەدا لێرە لەچ دەگەڕێیت ؟**

— **لەهیچ !**

— **چۆن لەهیچ ؟ یان چەکوشەکەت لێکەوتووەتە ناو ئاوەکەوە ..**

ئەمانە پیاوەکانی سەرەکپاسەوانانی شاربوون . پاسەوانییان دەکرد . وەستا عەلی ، شڵەژاو نەیزانی وەڵامی چییان بداتەوە . جگە لەخۆیان گەر کەسێکیان بەدەرەوە دەگرت ، بەکوتەك گیانیان دەردەکرد . بەڵام کاری بەدیان لەگەڵ ئەمدا نەکرد .

سەرەکپاسەوانان گوتی :

— **وەستا عەلی ، تۆشێت بوویت ؟**

— **نا ..**

بۆ نازانیت ئاغامان ڕازی نییە ، کەس .. نەك نیوەشەو ، تەنانەت لەپاش نوێژی ئێوارەشەوە بە کۆڵانەکانیشدا بگەڕێت نەك لەدەرەوەی شار ؟

— **دەزانم .**

— **ئێ .. لەم ناوانە لەچ دەگەڕێیت ؟**

— **لەهیچ .**

— **چۆن لەهیچ ...**

**....**

عەلییە پیرە کە بەپەلە لەو ڕێیەوە دەئەڕایەوە بە پێیدا ڕۆیشتبوو .. ئەوەی لە بەرلەکەمێك گوێی لێ گرتبوو ، لەگیاندا دەنگی دەدایەوە . بولبولەکان بەسۆزەوە دەیانخوێند . لەدوورەوە سەگەلی مۆلگە حەپەیان دەهات . لەکۆڵاندا تووشی کەس نەهات ، کە گەیشتە بەردەمی دووکانەکەی .. وەستا . حاجی لەقلەقی سەر دووکەلکێشەکەی هێشتا نەنووستبوون . وەکو تارماییەکی کفن کراو بەپێوە وەستابوو . دەرگاکەی بەتاڵ بوو . لەبیری بوو کە دەرچوو .. باش و توند پێوەیدا .. گوتی :

— **زۆر چاکە ، دەبێت با کردبێتییەوە .**

دووکانەکەی لەدەزگاو چەکوش بەولاوە چیی بەنرخی تێدانییە . ئەمانەش ئەوە ناهێنن کە بدزرێن . بۆ کاری کەس دەستنادەن تا دز خۆی بخاتە زەحمەتیی دزینەوەیان . دەرگاکەی لە ژوورەوە کلیلدا . دڵی دەگوشرا .. ئیدی ژیانی ناو شاریش جۆرە دیلییەتییەکە . لەچیاو گوندانیشدا بەرهەمو دەستکردەکانی برەویان نەبوو . لەپڕ ، هەستی بەماندووبوونێکی گران کرد . تاقەتی نەبوو لالەکەی بکوژێنێتەوە .

دەستی بەپەلە نایە سەر ئەو ڕەمەنزمەی لەلای چەپی کوورەکەوە بووو سەرکەوت . بەسەر ئەو نوێنەیدا پاڵکەوت کە لە کەوڵی وورچێکی گەورە پێکهاتبوو .

* * *

بە داچڵەکینێکەوە بە ئاگا هات . دەرگاکەی دەکوترایەوە . بەچاوی خەواڵووەوە هاواری کرد :

— **کێیە ئەوە ؟**

— **بیکەرەوە ، زوو ..**

— **...**

بەیانی بوو . لە درزی دەرگاکەوە داوەتیشکی سپیی بێ گەرد دەبریسکایەوە . ئەم ، هەرگیز وەها تا ئەم کاتانە نەدەمایەوە ، بەر لە خۆرهەڵاتن بەئاگا دەهات . ڕاستبووەوە ، لە ڕەفەکەوە بازی دایە خوارەوە . بێ ئەوەی پێلاوەکانی

بدۆزێتەوە ، ڕێی کرد . بەتوندییەکەوە قفڵی دەرگاکەی کردەوە . لەناو ئەو ڕووناکییەدا کە لەدەرگا بەتەواوی کراوەکەوە دووکانەکەی پڕکردبوو ، سەرەکپاسەوانانە سمێڵزلەکەی بینی . بەدوایشییەوە پاریدەرە لاوە کلاولبادینە جووت خەنجەرەکانیشی وەستابوون . وەکو بڵێ « چییە » تەماشای ڕووی‌کرد . سەرەکپاسەوانان گوتی :

— وەستا عەلی ، دووکانەکەت دەپشکنین .

عەلییە پیرە بەسەرسوورمانەوە پرسی :

— بۆ ؟

— ئەم شەو لەمۆلگەی بوداقبەگەوە دزی‌تراوە .

— جا من حەقم لەم دزییە چییە ؟

— دزەکان لەژێر پەردەکەدا بەرخێکیان لەو بەرخانەی کە دزیویانە سەربڕیوە . کیسە چەرمینە پڕ لە پارەکانیان دزیوەو یەکیان لەوێ جێ‌هێشتووە .

— من چی‌بکەم ؟

— دانەیەکی ئەو کیسانەشمان ئەم بەیانییە لە بەردەمی دووکانەکەی تودا دۆزییەوە ، لەپاشان سەیری ئەم ڕێسمەیە بکە . پەڵە خوێنی پێوەیە .

عەلییە پیرە بەو چاوانەی کە ڕێشکەوپێشکەیان دەکرد ، سەیری ڕێسمە پانەکەی کرد ، بەڕاسی ئەوەندەی لەپێك خوێنی پێوە سوابوو . ئەم کە بە واقوڕماوی سەیری ئەم پەڵە سوورە دەکرد ، سەرەکپاسەوانانی سمێڵ زل گوتی :

— من تۆشم ئەم شەو درەنگانێك لەسەر پەردەکەدا بینی ، لەچی دەگەڕایت لەوێ ؟

— . . .

عەلییە پیرە ، دیسانەوە وەڵامێکی پێ‌نەدرایەوە . بەبەردەمیدا ڕوانی‌و گوتی :

— پیشکنن ... و

کشایەوە دواوە .

سەرەکپاسەوانانو پاریدەرەکانی چوونە ناو دووکانەوە . یەکێکیان کە بەلای دەزگاکەدا ڕەت‌بوو هاواری‌کرد :

— ئای .. ئەوە ، ئەوە ..

— ! .

عەلییە پیرە ، بێ‌ئەوەی مەبەستی بێت چاوەکانی بەولایەدا وەرچەرخاند کە سەرەکپاسەوانان ئاوڕی لێ‌دایەوە . کەوڵێکی تاز گرواوی بینی . پەشۆکا .. پاریدەرەکان یەکسەر کەوڵەکەیان لە زەوی هەڵگرتەوە . هێشتا گەرم‌بوو . سەیرێکی ڕووی ئاغاکەیانیان دەکردو جاری دی ئاوڕیان لە ڕووی عەلی دەدایەوە . سەرەکپاسەوانان بە تووڕەییەوە پرسی :

— ئەو پارانەی کە دزیتن لە کوێت شاردنەوە ؟

— من پارەم نەدزیوە .

— ئینکاری مەکە ، ئەوە کەوڵی بەرخەکە لە دووکانەکەتدا دۆزرایەوە .

— ئەم کەوڵەم من لێرەم دانەناوە .

— ئەدی کێ دایناوە ؟

— نازانم ..

— . . . .

عەلییە پیرە ، هەرخۆی وەهابوو ، قەی زۆر نەدەکرد . کە برایە بەردەمی سەرۆکی پۆلیسانیشەوە هەر ئەوەی ڕوون نەکردەوە کە لەو درەنگەشەوەدا لەسەر پەردەکەدا لەچی دەگەڕا ، ئەو هەموو بەلگانەی کە پاسەوانەکان دەستیان کەوتبوو هەر هەمووی دژی ئەم بوون . پارەی پێنج سەد مەڕی بوداق بەگیش کە فرۆشتبوونی هەر لە مۆلگەوە دزرابوو . دوو دزی بەهێز ، شوانی پاسەوانیان توند دەستوپل‌بەست کردبوو .

بۆ ڕۆژی دوایی لە بەردەمی دادوەردا ئەم

شوانە . بە عەلیبە پیرە چوونی یەکێك لەو دوو دزانەی چەسپاند . تا شێوەیکی درەنگ نەگەڕانەوەی بۆ دووکان ، دۆزینەوەی کەوڵ لە دووکانیداو . کیسەیەکی پارەکانی لەبەر دەرگایدا .. بەس بوون بۆ تاوانبار کردنی عەلیبە پیرە . بە دانیشی پێدانەنێت .. دزیەکەی بۆ لێکنەدەدرایەوە بەتایبەتی لە لایەن میریەوە لە کوێوە هاتنیو کوێندەری بوونی ئاشکرانەبوو .

**بڕیار درا قۆڵی چەپی ببڕیت .**

عەلیبە پیرە ، کە ئەم بڕیارەی بیست ، بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا زەرد هەڵگەڕا . لێوەکانی خۆی گەزت . لە سەردانەواندن بەولاوە هیچی بۆ نەمایەوە .

بە پەشۆکاوی هەڵسایە سەرپێ .. بە دەنگێکی گرژوستەوە بە دادوەری گوتو پاڕایەوە :

— **لە قۆڵم بگەڕێن ، سەرم ببڕن .**

ئەمە یەکەم تکای بوو کە لە ژیانیدا دەیکرد . بەڵام دادوەری پیر بەدادبوو ، گوتی :

— **نەخێر کوڕی خۆم ، تۆ پیاوت نەکوشتووە . ئەگەر شوانەکەت بکوشتایە ئەو ساسەرت تێیدا دەچوو . سزا بەپێی تاوانە . تۆ تەنیا دزیت کردووە . دەبێت قۆڵت ببڕرێت ، ( حەق ) وەهای دەوێت .**

— . . . .

— . . . .

قۆڵی عەلیبە پیرە گەلێك لەسەری بەنرختربوو . لە سایەی ئەم دوو قۆڵەیدا شیش دووجاران زاخاو دەدات . لە سایەی ئەم دوو دەستەیدا سووکە شمشێری پەرەمەل ناسایی مەتالی پۆلایین شکێنو زرێی قورس دڕی ، دووکەرت کە رەوەی کڵاوی ئاسنینی بۆ هەزاران مێرد کە لەسەر سنوورەکاندا دەجەنگان بەرهەم دەهێنا . نەك بۆ پارە . بەڵکو لە عەشقی پیردا کاری دەکرد .

لە ژووری پاسەوانەکاندا کە لەبەر دەرگای سەرەکیپاسەواناندابوو توندیان کرد . لێرەدا چاوەڕوانی ڕۆژی سزای دەکرد ، هیچ دەنگی نەدەکرد ، بیری لەوە دەکردەوە کە کاتێك یەك دەستی دەمێنێت توانای ئەوەی نامێنێت کە لەسەر دەزگاکەیدا چەکوش بووە شێنێتو .. بەژارە دایدەگرت . دە پارەی پێنەبوو کە لە تۆڵەی قۆڵیدا بیدات . تائێستا کاری لە پێناوی پارەدا نەکردووە .

هەموو خەڵکی شار بۆ قۆڵبڕانی وەستایەکی پسپۆری وەك عەلیبە پیرە خەفەتبار بوون . پیاوێکی ئەمەندە لێهاتوو ، مەردو تێکۆشەر . بەهێزو جوان .. تا بێ ویژدانترین کەس بەرگەی ئەوەی نەدەگرت کە ببینێ .. تا مردن وەها بە کۆڵی ڕابکێشێت .

**ئەوەتا هەموو ئەویان خۆشدەویست .**

سەربازەکان بەڵێنیان بەیەکدیدا کە ئەم پیاوە ڕزگار بکەن کە شمشێری زۆر هەرزانی بۆ دروستدەکردن . چوونە لای محەمەدی دەولەمەندترین کەسی شارەکە ئەم زەلامەی کە ئەوەندەی قاروون دەولەمەندبوو ، تا نزمترین پلەش ڕژدوپیسکەبوو . ئێستا لە بازاڕی شاردا ، لە دووکانێکی بچووکدا قەسابی دەکا . بیری لێکردەوەو لێکی دایەوە .. ڕووی گرژکردو ، سەری داخست ، بەڵام پێویستە لەگەڵ سەربازەکاندا هەڵسوکەوتی باش بێت ، گوتی :

— **لەبەر ئەوەی کە ئێوە دەتانەوێت ، من لە تۆڵەی قۆڵیدا پارە دەدەم ، بەڵام بەمەرجێك..**

پرسییان :

— مەرجی وەکوو چی ؟

— بڕۆن پێی بڵێن ، ئەگەر تا دەمرم ، بە بەلاش خزمەتکاریم بکاتو ، بەشاگردیی من ڕازی بێت ..

— زۆر باشە ، زۆر باشە !

سەربازەکان بەپەلە چوونە بەردەرگای ئاغا . پێشنیاری قەسابیان بە عەلیبە پیرە ڕاگەیاند . لەپێشدا قەسابی نەزانینی خۆی بەبیانوو هێنایەوە ، نەیدەویست قبووڵی بکات .

سەربازەکان گوتیان : « دەدەی توخودا ، قەسابییش کارە ؟ ئەوەندە جەنگت بینیوەو شمشێرت بەخۆوە داوە ، سەری دەس وپل

بەستراو ناتوانیت بدەیت بەزەویداو شەری ببڕیت ؟.. بەم جۆرە ، یەخەیان بەرنەدەدا . بە ( دیلیدیلان ) بوون ، لەم دنیا بێفەڕەدا ، ( منەتباری کەسێك ) گرانترینی هەموو چەوسانەوەیەکە .

ئەو ، هێشتاکە زۆر لاو بوو ، چاکەی مامەتەی پێ بەرگە نەدەگیرا ، لە خانەی بنەماڵەی خۆی هەڵات تامنەتباری کەس نەبێت ، خۆی خستە دوور وولاتی ، دەبزانە ئێستا بەختە گێرەکەی خەریکە دەیکات بە دیلی کێ ؟.

سەربازەکان گوتیان : کوڕە حەفتا ساڵی ڕەت کردووە ، داخۆ چەند ڕۆژێکی لەتەمەن ماوە . هەر کە مرد تۆ سەربەست دەبیتەوەو ، شمشێرمان بۆ دروست دەکەیتەوە . دەی ، بیری لێمەکەرەوە وەستا .

* * *

قەسابە ، هەر ئەو ڕۆژەی کە پارەکەی لەتۆڵەی ئەو قۆڵەدا کە دەبوو ببڕرێت بۆ دادەوەر ژمارد ، عەلیەپیرەی دایە دوای خۆی ، هێنایە دووکانەکەی ، زەلامە ، پیرێکی ئێجگار بەدخووو ئێجگار بەدڕەووشتو تا بڵێیت بەرباد بوو . بەبێ پشوو منکەمنکی لێوە دەهات . لە ڕژدیباندا تاکو ئێستا خزمەتکارێك ، شاگردێکی ڕانەگرتبوو . هەر کە عەلیەپیرەی بەدەستخست یەکسەر لاتێشەیەکی لە گۆشەی دووکانەکەیدا جێکردەوە. جەواڵێکی خستەسەرو ڕەتبووو چوو لێیدانیشت . هەموو شتێکی بەو دەکرد ، هەر هەموو شتێك .. زوو بەئاگا دەهات . لەو مۆڵگەیەوە کە دوو سەعات لە شارەوە دوور بوو ئەو مەڕانەی وا ئەو ڕۆژە دەفرۆشران پێیدەهێنا ، بەوی سەر دەبڕین . بەوی کەوڵ دەکرد ، بەوی لەتلەت دەکردو .. پێیبەفرۆشتن دەدان . بەبێوەستانو تا ئێوارە هەر فرمانی دەدا . ئەوەی کە دەرخواردی بەستە زمانە دەدا تەنیا شۆربای ساوەر بوو . جاروباریش پاشماوەکەیانی ــ وەکوو بخاتە بەردەمی سەگێکەوە ــ دەخستە بەردەمیەوە. شەوانە سەراتاپای دووکانەکەی پێدەشۆردەوە ، بۆئەوەی تێرخەوبێت بۆ ڕۆژی دوایی سەرلەبەیانیی زووەوە بۆ مەڕهێنان دەینارددەوە مۆڵگەکەیەوە . تا هێزمیشی لە دارستانەوە بەو دەبڕی ، ئاوی بەو دەکێشا ، هەموو کارێك ، هەر هەموو کارێکی بەو دەکرد . تەنانەت کەندەوە بیری باخچەی ماڵەکەشی بەو پاك کردەوە .

عەلیەپیرە ، بەئاوی ڕووتو شۆربای ساوەر ، دەیتوانی ئەم هەموو زەحمەتییە ، ساڵەها لە سینەیدا جێبکاتەوە . بەڵام قەسابە تاوناتاوێك سەرکۆنەی دەدایەوەو دەیگوت : « کوڕە عەلی ، من تۆڵەی قۆڵە کەتم بۆ بژارد ، ئەگەرنا بە تاکە دەستێك دەمایتەوە » . بەرگەی دووبارە کردنەوەی ئەم پیاوەتییەی کە لەگەڵیدا کراوە نەدەگرت :

ڕۆژێك ، دوو ڕۆژ ، سێ ڕۆژ دانی بە خۆیدا گرت .

بە بێ وەستان کاری کرد . بەشەو خەوی لێنەکەوت . بە ڕۆژ هەڵەداوان .. لە بەردەمی گەورەیدا دەس لە سەر سنگ وەستا . دیسانەوە :

— **من تۆڵەی قۆڵەکەتم بژارد .**

— ...

— **ئێستا یەك دەستت هەبوو .. ها**

— ...

— **لە سایەی منەوە قۆڵت پێوەیە**

— ...

قەسابە ، ئەم گوتانەی لە شێوەی ( ئافەرین )دا کردبووە پارسەنگی زمانی خۆی .. لە باش بە جێ هێنانی هەموو فرمانێکی ، ڕیش بۆردی ، ناشرینە ، ڕووی گرژی هەڵبزڕکاندو بە چاوە شینە بە چاڵدا چووەکانی لە سەرتاپای ووردبووەوە . وەکوو بڵێت : « ئەوەت لە مێشکدا بهێڵەرەوە ، دیلی منی ! » وئەو تۆڵەیەی بیردەخستەوە کە بۆی بژاردبوو .

عەلیە پیرە ، بێ دەنگیی لێدەکرد ، هەستی بە پارچە پارچە بوونی دلی دەکرد ، بە لە سینەیدا بڵاوبوونەوەی شتکەلێکی گەرم گەرمو بە یەکدا خشانی چەناگە کلیل دراوەکانیو بە ژانی ژێر لاجانگەکانیەوە شەوان خەوی لێ نەدەکەوت . بە بەڕۆژیش کە کاری دەکرد ، لە چوونە مۆلگەو هاتنەوەیدا ، لە قەسابخانەدا کە بەرخەکانی کەوڵ دەکرد ، کە گۆشتی بۆ کڕیاران دەبڕییەوە ، بیری لێ دەکردەوە : « دەبێت چی بکەم ؟ چی بکەم ؟ » .



هیچ شتێکی بڕیار نەدەدا . لە دنیادا کە «ماڵئاوا»ی بە هیچ کەسێك نەگوتووەو ویستوویەتی لە ئامەرانیی سەربەرزیدا بژیت ، ئەم بەلایە چی بوو بەسەریدا هات ؟

هەڵهاتنی بە پیاوەتی نە دەزانی .. نەمە بکات ، ئەم جارەیان بە ڕاستی دەبێتە دز . بەڵام ، کە ئەم زەلامەش تاوناتاوێك سەرنۆبەی دەدایەوە .. خۆڕاگرتن .. لە مردن زۆر زەحمەتترە ، لە : مردن زۆر تاڵترە ، لە مردن زۆر قورسترە .

* * *

حەفتەیەکی ڕێكبوو ، بوو بوو بە دیلی قەسابەکە . لە ڕۆژاندا ڕۆژی هەینی بوو ، دیسانەوە هەر زوو چووبووە مۆلگە . مەڕەکانی هێنابوو . لە قەسابخانەدا کەولی کردبوون . بە قەنارەی دووکانەوە هەڵیواسیبوون . بەردە ڕەشە ڕۆناوییە زلەکەی لای چەپی دەزگاکەش قیمەییشەکەی دەناسییەوە . دیسانەوە بیری لێ کردەوە « دەبێت چی بکەم ، دەبێت چی بکەم ! » . بە دگان لێوەکانی دەگەزت . هێشتا وەستا نەهاتبوو . کە لە قیمەکێش تیژ کردنەوە بووەوە . دەستی بە لە هەسانداںی چەقۆکان کرد . « دەبێت چی بکەم ؟ دەبێت چی بکەم ! » ... بە شێوەیەك چوو بە ناخی بیرکردنەوەدا کە ئاگای لە هاتنی قەسابەکە نەبوو .. ناوەختەو .. دەنگی نووساوو بەد دلی ختە ناو دەمیەوە .

**ــ ئەی تۆ چی دەکەیت ؟**

ئاوڕی دایەوە ، وەستاکەی ، لە گۆشەکەیدا دانیشتووە ، دارجگەرەکەی دووکەڵدەدا .

**ــ چەقۆکان تییژ دەکەمەوە .**

**ــ ئای تەمەڵ ، هەی بەستەزمان .. لە بەیانییەوە چییت کردووە ؟ .**

ــ ...

وەلامی نەدایەوە چاوی بێ تروکاندنەوەی بڕییە ئەو چاوە پێڵوو سپیس بووانە ، ئەو چاوە ناپاڵانە ، ئەو چاوە مارانە . ڕوانی .. پیرە ، لەم ڕوانینەی کە چاوەڕوانیی نەدەکرد تووڕە بوو . پرسی .

**ــ بۆ دەڕوانی .**

ــ ...

عەلیبە پیرە ، دەنگی لێوە نەهات . بە ڕوانینێکی مرۆڤ پلێشێنەوە لەو زەلامە وورد بووەوەکە ، لە کاتێکدا لە ماوەی حەفتەیەکدا ، بەشی پێنج ساڵ کارکردنی بێ حەسانەوەی دەبینێت . ئینجا بە « تەمەڵو بەستەزمان » جنێوی پێ دەدات . دیسانەوە دڵی وەکوو بڵێیت دابدڕێت وەها بوو . شتکەلێکی گەرم بە ناو سنگیدا بلاودەبووەوە . چەناگەکانی تیل دەدران.

ژێر لاجانگەکانی دەستیان بە ئێشو لێدانەوە دەکرد . لەم کاتەدا ئەم لەرزەیە لە پڕ وەستا . عەلیبە پیرە ، چاوەکانی کردەوە . داخۆ ماوەی حەفتەیەك چۆن بەرگەی ئەمەی گرتووە ؟ شلەژا .

قەسابە . دارجگەرەکەی نایە لاوە . تا لەم نیگا قورسەی خزمەتکارەکەی ڕزگار بێت ، تووڕە بوو دەستی کرد بە قرە قر :

**— به هەر حاڵ ئەوەت لە بیر چووەتەوە کە تۆلەی قۆڵم بۆ بژاردوویت . من نەبوومایە ئێستا یەك قۆڵت مابووەوە .**

**— ...**

عەلیبە پیرە . دیسانەوە وەڵامی نەدایەوە . بە پەژارەوە کەنینەیەکی کرد . سوور هەڵگەڕا ، ئینجا لە پڕ زەردبووەوە . بە پەلە سووڕایەوە . گەورەترینی ئەو قیمەکێشانەی ڕافڕاند کە تیژی کردبوون . قۆڵی چەپی نایە سەر دەزگادارینەی قیمەکردنەوە . ئەو قیمەکێشە قورسەی کە بەرزی کردبووەوە بە جۆرێکی وەها هێنایە خوارەوە کە .. لەو کاتەدا قۆڵە قرتاوەکەی گرتەوە . توند هەڵیدایە بەردەمی ئەو قەسابەی کە لە تاو بینینی ئەم ڕووداوەوە دووچاوی دەرپۆقیبوونو پێی گوت :

**— بگرە بزانم . ئەمە ئەو شتەیە کە تۆلەیت بۆ بژارد .**

ئینجا قۆڵی ئەو جلکانەی کە بە بێ قۆڵ مابووەوە توند گرێ داو . لە دووکانەوە دەرچوو .. هەر وەکوو ئەو شوێنەی جارانی کە لێی هاتبوو . ئەمجارەش کەسێك لە شاردا تێنەگەیی بۆ کوێ چوو ..

* * *



چیرۆکی : بشی‌توان
وەرگێرانی : د. کاوس قەفتان

# پەپوولەی تاوە سوورەکە

هەموو جار باوکەکە لە کاتێکی تایبەتیدا ئەگەیشت ، لەو کاتەدا کە شەمەندەفەرە کەهرەباییەکە شاری بەجێ ئەهێشت . لەوە ئەچوو ئەوساتەی بۆ دیدەنی کورەکەی هەلبژاردبێت کە بێ‌دەنگ بێت . هەر کە ئەگات یەکسەر روو ئەکاتە دایەنخانەی ژمارە ۱۲ کە پەپوولەیەکی لە تاوی سوور دروستکراوی پیاهەلواسراوە . ئەژنۆی ئەخاتە سەر زەوی‌و بە ووردی ئەگەوێتە خوێندنەوەی قابلەرۆژانەکەو رادەی گەرمایی .

مەمکخۆرەکە بەهێواش بهێنە ، دایەنخانەکە بکەرەوە ، منالە مەمکخۆرەکە ئەنوێت ، کەللەی لە بەراوردکردندا لەگەل رووە نوقم‌بووەکەی لەناو قوماتە سپی‌یەکەدا گەورە ئەنوێنێت . بە قورس‌و لاوازی‌یەوە هەناسە ئەدات .

هەتا ئەمرۆ شیر دلۆپ دلۆپ ئەکەنە دەمی‌یەوە ناتوانی بیخواتەوە . لە دایکە تازەکانی تەنیشتی بپرسە . دلۆپی یەکەم بخەرە سەرلێوی بە ترسەوە راست ئەبێتەوە ، ئەلەرزێ ، لەخۆیەوە دەم ئەکاتەوە ، دلۆپ دوای دلۆپ ئەبات‌و قووتی ئەدات . هۆلەکە کپ‌و بێ‌دەنگە ، تەنیا دەنگی ئاوە لەکولاوەکە دێت کە بلقی هیلاك بەرز ئەکاتەوە وتەمێکی سپی دروست ئەکات‌و زۆر نابات ئەتەنێتەوەو هەواکەبو منالە نوێ‌یەکان گەرم ئەکات .

بەم سەرقالی‌یەی خۆمەوە چاوم لەوەبە چۆن پیاوەکە سەیری جوولانەوە کەمەکانم ئەکات . هەرکە دووا تنۆک ئەخەمە سەر لێوی مەمکخۆرەکە ئەبینم دەفتەرە بچووکەکەی دەرئەهێنێت‌و شتی تیا ئەنووسێت کە نازانم چی‌یە . باش ئەوەی بەسەری سلاومان لێ ئەکات بەجێمان ئەهێلێت .

**— کەی باوکی واباش بووە !**

« موی » هاورێیم لەپاسەوانیدا ئەم پرسیارەی لێ‌کودم‌و بێ وەستان لەسەری رۆیشت :

**— ئەزانی ، هەموو جار ئەبێ چەند کیلومەتر ببرێت هەتا بگاتە ئێرە ؟ شەست ، بەم‌سەرو بەوسەرەوە ، لەم هەوانسرمو ساردەدا .**

لە ژووررووی رۆژهەلاتەوە بایەکی وەرزی‌ی لەگەرداو چوو هات لق‌و پۆپی دار سنوبەرەکە کەوتە لەرزین ، گەلاکانی پچران‌و فرێ‌ی دانە سەر زەوی . گومانی نی‌یە شەقامەکان بەشەو چۆل‌و تاریک بوون . ئەوسا وێنەی پیاوەکە هێنایە بەرچاوم چۆن سواری پاسکیلەکەی بوەو لەتاو رەشیەبە پشتی نووشتانۆتەوە . دلم خۆش بوو کەدیم هەموو رۆژی نەختە نەختە تەندرووستی منالەکە باشتر ئەبێت ، بۆ نموونە گرژبوونی کە



بوەو ناساغییەکەشی لەخۆشیدا
روەوچاکە چوو ...

زۆرم پێ ناخۆش بوو
دەستگیرانەکەم هەستی بەم
دڵخۆشییە کەمەم نەکرد .
بەپێچەوانەوە هەمیشە ئەپرسێت :
دیسانەوە پاسەوانیت ! ئەزانی ئەم
رۆژانە رەنگت هەڵبزرکاوە . پێم
ئەڵێ : وەکو جاران سووری لەسەر
ئەوەی بچیتە قوتابخانەی
هونەری بەوە !

ئەزانم بیر لەوە ئەکاتەوە زیاتر
بحەوێمەوەو کەمێک بای باڵی خۆم
بدەم . بێ گومان بەڵینەکانی جارانمی
دێتەوە یاد ، کاتێک بڕیارمدا بێم و
بەتەنیا لەهۆڵی لەدایک بووە
نوێیەکاندا ئیش بکەم . ترس لەم
رۆژەدا خەوی لەچاوم بڕی و
ئارەزووی خواردنی نەهێشتم . ئای
لەم لەدایک بووە نوێیانە ، هەموویان
... وورن ، تاو ئەو رادەیەی
بتترسێنن .

چۆن شیریان بدەمێ ؟ لەبەر
ئەوەی هێشتا زۆر منالێ نازانن هەتا
مەمک بگرن و هیچ قووت بدەن .
هەتا ئەمرۆ منالێکم نەشتووە . ئەو
کاتەی بڕیارمدا هەر کارێک بێ لە
پێناوی نیشتماندا بخەمە ئەستۆم ،
قەت بیرم لە منالی شیرە خۆر
نەئەکردەوە . هەموو رۆژێ دایکان
سەریان لێ ئەدایێ ، گفتوگۆ کردن
لەگەڵیان کارێکی قورس و گرانە .
روویان لەناو دەستیانا ئەشارنەوەو
ئەکەونە گریان ، لەم کاتانەدا ،
بێ ئەوەی بیر بکەمەوە ، وەکو
قەوانێکی کۆن ئەڵێم : « بڕوامان
پێ بکەن ، بڕۆنەوە ماڵی خۆتان ،
ئێمە لە جیاتی ئێوە شەوو رۆژ
ئاگامان لە منالەکانە » .

بەڵام کە ئەمزانی ئەم قسانە
جێگای خۆیان ناگرن هەستێکی
ئازاراوی دای ئەگرتم .

دایکەکان بەگومانەوە سەریان
بەرز ئەکردەوەو وەکو بپرسن :
چۆن بڕواتان پێ بکەین . ئێوە هێشتا
منالن و دایکەکانتان ماڵتان بۆ پاک
ئەکەنەوە .

منالەکانیان بەدەستێکی
دوودڵەوە پێ ئەدەن . چاوەکانیشیان
ئەگەرێن و ئەپشکنن جاری وا هەیە
جووتێک ئەبینن بەیەکەوە نووساون و
لەترسا وورووژاون و سەعاتەها
بێ دەنگ دائەنیشن . دووایی
مێردەکە دەستی ژنەکەی ئەگرێت و
لەوە ئەکات لێی بپارێتەوەو نەک
دڵ خۆشی بداتەوە . « لە هیچ
مەترسە ـ لە هیچ مەترسە » .
بەڵام قسەکانی بەفیرۆ ئەروات .
تێ گەیشتم تەنیا ئەوەی بۆ ماوەتەوە ،
ئێمە چی بۆ ئەکەین .

شارەکە هەمیشە لە دۆخی خۆ
ئامادەکردندا بوو ، فڕۆکە
ئەمریکاییەکان بە شەو بۆردومانیان




خوارن . جاروبار ســـــــەیری دایەنخانەی ژمارە ١٢ ی ئەکرد ، ئەو شوێنەی منالەکەی تیا نووستبوو ، ئەو شـــــوێنەی بەپوولەی تاوی سووری پیا هەڵواسرابوو . شوێنی ترس .. شوێنی مەترس‌و مردن .

لەو ساوە : بەلای کەمەوە هەموو رۆژێ باوکە کەوتە ســـــەردان .

دەنێرە بچووکەکەی خۆی کردبوو بە فایلێکی پزیشکی . هەموو شتێکی تیا ئەنووسی . گەرمایی ، هەناسە ، چەند جار هەناســـــە پێ‌کردنی دەســـتکرد ، پێســـت ، رادەی شینێت دەســـت‌و پەنجـەکانی ، رادەی خوێـن تێ‌کـــردن ، رادەی خواردنی شیر ، رشانەوەو ئـــەم جۆرە شـتانە . بەرە بەرە ئێمەی دایەنان ، بە تارمایـیە پان‌و درێژەکەی راهاتین . ئێمەی دایەنان کە ئەبوایە منالانمان پشنابەو شـــیرمان پێ بدانـایـەو دەرزیمان لێ بدانـایـەو خوێمان بکردایـە دەمارەکانیانەوە .

ئەبوایە هەموو رۆژێ بەســــــەر دایکانەوە بگەرامایە بۆ ئەوەی کوێی شیر کۆ بکەمەوە .

هەمیشە درەنگ ئەگەمە ماڵەوە ، هیلاک‌و پەک‌کەوتەو بەسەرێکی پڕ لە داخ‌و خەفەتی بێ کۆتاییـــەوە ، گارگەکەی ئۆکسجین بەرێک‌و پێکی داناگیرسێت . کەواتە ئەبێ دەست بکرینەوە . واتە هەناسەی دەستکرد بەکار بهێنین بۆ ئەوەی مردنی منالان کەم بکەینەوە . هەتا لە ماڵیشـــەوە ئەمانە وازم لێ ناهێنن . کاتێک ناو ئەخۆم ئەوەم بیر ئەکەوێتەوە منالێک هـــەموو خواردنەکەی هێناوەتەوە

دڵم تەنگ ئەبێت‌و ئەپرســـــم چی بکەم ؟

ئەکرد ، بەشـــەو ، ئەو کاتـــەی منالەکان‌و دایکەکان خەویان ئەبینی ، جاروبار ئۆتۆمۆبیلی چارەکـــردن منالانی بۆ ئەهێنابن .

لە رۆژانێکی وەهادا بوو دایك‌و منالە ژمارە (١٢) کەیان بۆ هێنابن . دایکە لاوازە چاو بەقوولا چووەکـــە ئەیپرسمان : « کوا شیرە خۆرەکەم ؟ ئای . فرۆکەکان بـەخێرایی هاتن‌و هەر ئەوەم پێ‌کرا خۆم بدەم بەسەر شـــــیرە خۆرەکەمداو بەلەشم دایپۆشم » .

پارچەی بۆمبا هەتا ئەم ســـاتـە بەسـەر سەربانەکاناو بگرە لە باغچەی خەستەخانەکەدا ئەرژێ . پەنامـــان بردە بەر دەرمان خانەکە بۆ ئەوەی خوێن بۆ دایکەو شـــیرە خۆرەکەی دەســـت خەین . کار لەکارترازاو دایکەمان رزگار نەکرد .

شـــــیرە خۆرەکە کەمێک هەناســــەی‌دا . پزیشـــکەکە بەمیهرەبانی‌یەوە پەنجەیەکی خستە لەپی دەستی‌یەوە . بەلام دەســـتی نەجوولا ئەو پەنجەیە بگرێت . چەند جـار شرینقەمـــان لێ‌دا ، بـــەلام جوولـــەی نەکرد . لەوە ئـــەچوو مردبێت . کە سەیری فایلەکەیم کرد تەنیا ئەمەی تیا نووسرابوو :

**ـــ دایك ، تەمەنی ٤٣ سالە .**

ئێوارە ، باوکـەکـە هـــات .

بێ‌دەنگ ، وەک کێـلی گـــۆر بێ ، بەرامبەرم دانیشـــت . ناوچەوانی وەک بەرد ، دەستەکانی گەورەو رۆژ سووتاندبوونی.پەنجە ئەستوورەکانی لەیەک ئالاندبوو . دەرەوە گـــەرم نەبوو ، بەلام ئاو بەناوچەوانیا ئەهاتە



**وادیارە دایکم هەستی بەم گۆڕینەم کردووە . ڕۆژێک پرچم دائەهێنا ، لەپڕ چاوی بڕی‌یە چاوم‌و هاواری کرد : « کچم ئەوە چیتە ؟ چاوەکانت ... » . بە ووردی سەیری ئاوێنەکەم کرد . چاوەکانم ئەبریسکانەوە ، لەچاوی ئەو دایکانەی ئەکرد لە درزی دەرگاوە بەدزی‌یەوە سەیری دایەنخانەکانیان ئەکرد کە منالەکانیانی تیا خەوتووە.**

لەوساوە دایکم هیچی تری نەووت ، بەلام جارو بار بەدزی‌یەوە جلەکانی ئەبردم‌و ئەیشت‌یان لەبەر من‌خواردنی‌ئامادە ئەکردوو ئەو چیشتانەی لێ ئەنا کەمن حەزم لێ ئەکردن . کە ئەبینم خۆمم پێ ناگیرێت‌و بەدەنگێکی نزم ئەلێم :

**— لە پێناوی ئێمەدا خۆت زۆر هیلاک کردووە ؟**

بەبێ‌دەنگی سەری ڕائەوەشێنێ‌ـەوە ئەگەم هەوڵ‌و کوششەکەی زۆر لاسادەیە ، ئەگینا چۆن مانی هەلگرتنی ناوی دایکی ئەبێ ، ئەگەر لە پێناوی منالەکانیدا خۆی بەخت ئەکات .

حەزم زۆر لەوەیە کاتێ دایکم باس منالیمان ئەکات ، ئەوساکە شیرە خۆرە بووین‌و ڕەنگ بەمەیی وەکو مشکەکان . کە ئەچوو بۆ سەرنیش گەرم دای‌ئەپۆشین . ێش لەدایک بوونم باوکم لەهیلاکیدا رد . دایکم گومانی لانەما کە ئەتوانم هەناسەی دەستکرد بۆ شیرە خۆرەکان بکەم‌و هێندیکیشیان ـۆم . خەریک بووم واز لە خوێندنی میکانیک بێنم بەلام دەستگیرانەکەم هەمیشە ئەیخاتەوە

بادم ، منیش بەسەرزاری ڕازی ئەبم . زۆرم لاناخۆشە کە بەناچاری ئەمێنمەوە بۆ شەونخوونی‌یەکی چاوەڕوان نەکراو ، بەوەش بێ‌بەش ئەبین لەوەی بەیەکەوە فلیمێک ببینن . چەند جار دووا کەوتم جارێک .. دوو جار نازانم ! کاتێ هاتنە دەرەوە دێت بەشوێنما ، هەتا کە درەنگیش بێ لەلای درەختی سنوبەرەکەوە چاوەڕوانیم ئەکات بۆ ئەوەی بمگەنێتەوە مالێ . لەرێگاش قسەم بۆ ئەکات یان ئەو گورانیانەم بەهێواشی بۆ ئەلێ کە هەردووکمان حەزی لێ ئەکەین .

بە زستانان شەو زوو دایەت ، ڕۆژ نەختێک ئاوا ئەبێت‌و لەبەر دنیا تاریک ئەبێت ، بەرە بەرە ڕەنگی باغچەکە ئەگوڕێت لە سەوزێکی هەلبزرکاوەوە لەبەر ئەبێتە

ئەرخەوانی‌یەکی تۆخ . لە دلەوەر بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی گۆڕینی دەستەی کارکردن ئەکەم بۆ ئەوەی بکەم بەدەستگیرانەکەماو ئێوارەیەکی تەواو بەیەکەوە بەرینە سەر .

یەکەم شت باس بکەم ، باس چوونە دەرەوەی چەند شیرە خۆرێکی بۆ ئەکەم ، هەر ئاناسرێنەوە چاوە ڕەشەکانیان ئەبریسکێتەوە ، ڕوومەتەکانیان پڕو کاڵ لەقۆخی بێ‌گەیشتوو ئەچی . داوامان کرد وێنەیەکیان لەگەلدا بگرین . هەموومان هەستمان بەسەربەرزی کرد . لەم کاتەدا نازانی چەند خۆم بەکامەران ئەزانم کە چاوم بەیەکێک لەوانە بکەوێ کە وولاتەکەمان لەدووا ڕۆژدا دروست ئەکەن . ڕەنگە پاش ماوەیەک لەمە بگەیت . ئاخ ! خۆزگە

ئەو باوکەت ئەدی کە هەموو ڕۆژ بەوسەرماو سۆڵەیە دەیەها کیلۆمەتر ئەبڕێت هەر بۆ ئەوەی بزانی ئەخۆشەکەی چۆنە ، بەڵێ خۆزگە ئەو باوکەت ئەدی .

ئەبێ دڵنیابم لەوەی بۆمبای نۆکسجینەکە تەواو ئیش ئەکاتو پێشەکی حسابی ئەوە ئەکەم ئەمشەو چەندی ئەوێت. لەپڕ میکرەفۆنەکەی ئەولای خانووەکە کەوتە هاوارو دەنگێک ووتی : « دەنگو باس دەربارەی گەردەوێک لە دەریادا » .

لە جێگای خۆم ووشک بووم‌و چاوم بڕی‌یە دایەنخانەکان .
« ئەمشەو لە خوارووی چینەوە هەوایەکی سارد دێت‌و هەڵ ئەکاتە هەریمەکانی‌ژووروی وولات‌و باران‌و گەرداو لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێ ، خێرایی با لەسەر زەوی : ٥ ، ٧ . هەوا سارد ئەبێت ... » .

گەرداوێکی تر وەکو گەرداوەکانی تری ئەم زستانە . وەرزیکە دایکان هەمیشە حەزی لێ‌ناکەن . هاوری‌یەکەم لە پاسەوانیدا گەیشت. بەدەنگێکی نزم هانی‌دام‌و وتی : دەی ئامۆژگاری‌یەکان دانی‌و برۆ ، ئەگینا یەکێکمان لێ‌راست ئەبێتەوە شکات بکات . زۆرزانانە پێ‌کەنی‌و لەبەر خەفەت دایگرت .

**— چی ڕووی‌دا ؟ لەوە ئەکات سەر سوورماوبی ؟**

— کوێت لێ نەبوو . گەرداوێکی تر لە دەریاوە .

**— ئینجا چی‌یە ؟ ئەتەوێت چی‌بکەین .**

وەکو بێ‌دەسەڵاتی پیشان بدات هەردوو شانی بەرز کردەوە .
ڕاستە . چیمان لە دەست دێت .

هەردوو چاوەکانم خۆیان بڕیبووە دایەنخانەی ژمارە ١٢ . دایەنخانەکەی پەپوولەی تاوە سوورەکە . منالەکە ئەمرۆ باشترە ، بەڵام هێشتا هیلاکەو هێزی تێدانی‌یە .

گەرداوەکە باغچەکەی هێنایە لەرزین . لق‌و پۆپی درەختەکان بەگرمەوە ئەشکان . باران بەلێشاو ئەباری . لە پەنجەرەکەوە لق‌و پۆپی تەڕبووی لەرزاوی سنۆبەرەکەم دی ، کە نیشانەم لەسەر قەرویلەکان دانا ، هەستم کرد دەنگم کەمێک گۆڕراوە .

**— شیرە خۆری ژمارە ٢٥ پەپوولەی سوورە ، کەم ئەخوا ، زوربەی کات شین هەڵگەراوە . بێ‌وەستان ئۆکسجین بڕیژێ .**

— شیرە خۆری ژمارە ١٢ ، بە زۆری بێ دەنگە ، سیەکانی هەویان کردووە .

لە پەردە تەنکەکەی دایەنخانەکەوە سەیرم کرد . ژمارە ١٢ بەلاوازی هەناسە ئەدات . چاوەکانی نیوە داخراون . هەمیشە هۆش بەخۆی نی‌یە . بێ‌گومان ئاگای لەوەنی‌یە لەدەرەوە گەرداوەکە لە گرمەگرمدایە .

— لەم منالە غافل مەبە . هەموو کات ناجوولێت . پێویستە هەموو چرکەیەک بگرە هەموو سانی‌یەیەک چاوت لێ‌ی بێت .

ناتوانم بڕۆم . خۆم دووا ئەخست ، ئەمەش خویەکە فێری بووبووم . یەک شەو لێ‌یان دوور بکەومەوە هەست بەدڵ تەنگی ئەکەم . ئەمرۆ شیرە خۆرە ناوچەوان رەقەکە جوانتر ئەنوێنێ ، دەمی پانە بەڵام ڕووخۆش بێوە دیارە . کە چاوەکانی ئەکاتەوە ، ئای ئەوچاوە رەشە بەلای شین جووانەدا چەند جووانن . ئەمەی تریشیان بە قژە لەزەرد چووەکەیەوە جووانە . ئەمرۆ ئەختێک ڕوومەت‌و رەنگی پەیدا کردووە . لووتە بچووکەکەش جووانە ، رۆژێک لەرۆژان بەحەزکردنەوە سەیری ئەکەن . هەموویان نووستوون ، لەبووکەشووشە ئەکەن . لەدەرەوە باران کەم بۆوە بەڵام رەشەباکە تینی سەند هاوری‌یەکەم بانگ‌کرد .

**— چونگ پێم ناڵی‌ی !**

— چی ؟

**— ئەزانی منالی ژمارە ١٢ ی پەپوولەی سوور .**

— ئەزانم . چی ڕووی داوە .

— رۆژی بوردوومانەکەی « یەنکی » دایکی مرد . خۆی دا بەسەر منالەکەیدا بۆ ئەوەی بیپارێزێت . ئەبوو باوک‌و دایکی هەتا دوای چل‌ساڵە چاوەروان بن تا منالی یەکەمیان ببێت. ئەختێکی‌تر باوکی دێت .

« هونگ » بەسەر سوورماویەوە ووتی : بەڵام نیشانەکەت دامێ .

ڕاست ئەکات . بەڵام لەگەڵ ئەوەشا تەسکینیم نایەت . هەست بەوە ئەکەم کەتەنیا من بەتەواوەتی لەم منالە ئەکەم . بەزەحمەت هەناسە ئەدات لەبەر ئەوە یەک چرکە ئاگامان لێ‌ی نەبێت جارێکی تر هەناسە ناداتەوە .

ئەمشەویش بارانە ، رەشەبایە ، ساردە . ئەگەر ئەمشەو بەرێتە سەر ... ئەگەر ئەمشەو بمێنمەوە !

بەلام نا . من تەواو نیم . جارەهای جار بەلێنی خۆم بەجێ نەهێناو ەچوومە لای دەستگیرانەکەم . ئەبێ ەستەو لەم گەرداوەدا ئێرە بەجێ هێلم ، باران بەردەوامە ، چراکانی گری مەدەنی لەسەر پەتەکانیان ەلەرزن . بێ گومان چاوەروانیم ەکات . چیم بۆ ئامادە کردووە . ەلەکێک بە دەست دروست کرابێ ەگەل دوو جووت گۆرەوی و ووتەیەکی فلچەی دان شتێ . ەرو دلی خۆش ئەکات . وا ئەو ەمەنەفەرەی ئەیهێنی ، فیکەی ێدا . هەر لەو کاتەشدا ەمەنەفەرێکی تر شار بەجێ ەهێلێ .

ەپر هاورێ یەکەم لەپاسەوانیدا هاواری کرد :

**— خێراکە . شیرەخۆری ژمارە ١٢ .**

وەکو زەمبەلەکێک فرێی دابم ، ردمدا . شیرە خۆرەکە هەناسکە کێی بوو ، چەند پەلەیەکی شین ەسەر رووی و دەوربەری چاویدا ەرکەوت ... هەناسەدانیش لاوازبوو . کەوتە نزگەرە . فەرمانمدا ەهاورێ یەکەم : خێرا پزیشکێک ۆزەرەوە .

دەستم برد بۆ قاچەکانی،لە ئاسنی ساردیان ئەکرد . بەنەرمی خووم رد بەرەویا ، بەلام چاوەکانی بێ جوولە مانەوە . هەموو لەش بێ جوولەیە . دلی لە لێدان وەستا . ەنەرمی کراسە خووریەکەیم لابرد . ەدوو پەنجە سنگە لە کاغەز تەنک ووکەیم هەنوو . نووشتامەوەو دەمم خستە سەر دەمە ساردەکەی ەولمدا گەرمایی لەش و گیانمی ەمێ . ئاو بەناوچەوانا ئەهاتە خوارێ .

چەند دەرزییەکی گورج بوونەوەمان لێدا . دەنگێک لە سنگییەوە هات .. دەنگێک نەئەبیسترا . بەردەوام بووم لە هەناسەدانی دەستکردا . نازانم چەند مامەوە ، وازم نەهێناو دەستبەردار نەبووم هەتا کراسە تەربۆکەم بەلەشمەوە نووسا . دلی بەلاوازی کەوتە لێدان . دیسانەوە وەستایەوە . لەم کشوماتییە بێ سنوورەدا هەستم کرد ماسوولکەکانم رەق ئەبن . لەپر دنیا لەبەر چاوم تاریک بوو . هەستم کرد سەری زبانم سوێرە . رەنگە قەت جارێکی تر ئەم شەوە نەبینمەوە ، ئەم شیرە خۆرە نەبینمەوە کە لە خۆم بەنرخ ترە . ناو سەرم دەنگی ئەدایەوە . ئەم شیرە خۆرە ئەروات . هی خۆمە ، مال و مولکی خۆمە . هەتا هەتایە هی خۆمە . دۆرگەو درەختەکان لەشەردا بوون . گەلاکان بەزرمەوە ئەکەوتن . بەسەریا نووشتامەوە ، بریارمدا ئێرە بەجێ نەهێلم . بەسەریا نووشتامەوەو هەناسەی خۆمم ئەدایە . هەستم بەبۆنێکی ناخۆش کرد لە گەروما . گرنگ نییە . بۆوی پیاکە . لە کاتی وەهادا هیچ شتێک ناگاتە هەناسەی دەستکرد . پەنجەکانم وازیان نەهێنا سنگە تەنکەکەی بەهەنوون .. پێنج دەقیقە .. دە دەقیقە رۆیشت .. دلی شیرە خۆرەکە کەوتەوە لێدان .

پاش ماوەیەک بەهۆی دەرزی لێدانی بێ وەستان لێدانی دلی باشتر بوو . لێوەکانی گەرم بوونەوە . برژانەکانی کەوتنە جوولان . لەخۆشیا شێت بووین ، بەرادەیەک هەستمان نەکرد باران لە دەرەوە وەستاو گەرداوەکەش هێمن تر بۆوە . ئەوسا هەستم کرد قاچەکانم گرژبوونیان نەما ، هۆشم هاتەوە بەبەرخۆما . ئاورم دایەوە نازانم کات چەندە . بروام نەکرد . هێشتا کاتی نەهاتووە ! بەخێرایی رام کرد خۆم بگۆرم . لەو خێراییە بلووزەکەم لەدەرگاکە گیراو دڕا .

ناتوانم لە دەرگاکە تێپەڕم و سەیری ئەکەم . شیرە خۆرەکە قوول نووستووەو ئاگای لە هیچ نییە ، « باشە . باوکی دێت » . خێرا بەلام بەدوواکەوتوویی وە گەیشتمە خوواروی پیپلکەکە . لە دوورەوە گوێم لە فیکەی شەمەنەفەرەکە بوو . شەمەنەفەرەکە رۆی ، فیکەکەی لێ ئەدا ، فیکەیەک لە مال ئاوایی ، لەبەلێن و لە سەرزەنشتیش ئەچوو .

**کەسووار بووم دەنگی میکرەفۆنەکە ئەیووت : « گەرداوەکە بەرەو خووارووی هەریمی چووارەم ئەروات و دووایی هیلاک ئەبێ . سبەینێ ئاووهەوا خۆش ئەبێ و گەرماییش لەپلەیەکی نزمدا ئەبێ .**

سبەینێ منالەکان باش ئەبوون . هەستم بەئەسکین کرد . ئەوە دووا شەمەنەفەر شاری بەجێ هێشت و پاش ماوەیەکیش باوکە ئەگات .

شیرە خۆری ژمارە ١٢ نووستووە . دلۆپێک شیرم خستە سەر لێوی تاراستی بکەمەوە ، هەموو دلۆپی شیرەکەی خواردەوە: ژوورەکە کپ بوو . تەنیا دەنگی ئاوە کولاوەکەی ناو مەنجەلەکە ئەهات .

هەلمێکی سپی بەرز ئەکردەوە زۆری نەئەبرد ئەتەنی‌یەوە . گەرمایەکی خۆش هۆلەکەی داگرت . لەپر هەستم کرد لەشەوێکی بەهاردام .

# کوڕی سەرباز

یەکەم جاری بوو باوکی خۆی لە سینەمابینی ، تەمەنی منداڵەکە ئەو دەمە پێنج ساڵ زێدەتر نەبو . ئەمە لە پشتبیرە گەورە سپیەکەدا ڕویدا ، هەموو ساڵی لەوێ مەڕەکان برینگە ئەکرێن . تا ئێستا ئەو پشتبیرە سپیە گەورەیە بەتەلاشەدار داپۆشراوە لەنزیك ڕێگاکەیە ، نزیك بەندەنەکە ، پشت کێڵگە فەرمانڕەوایی‌یەکە .

لەگەڵ دایکی بۆ ئێرە هاتبو ، جینجولی دایکی – کرێکاری سەر تەلیفۆن بوو لە نووسینگەی پۆستەی کێڵگەکە – لە هاوینی هەموو ساڵێ ، ئەو کاتەی وەرزی برینگە ڕاهاتبو ، لە مەڵبەندەکە کار دەس پێ ئەکا ، لەبەرئەوە پشووی ساڵانەو بکا ، لەبەرئەوە کە بۆی کۆبوبوەوە ڕۆژانی زێدەکار بەشەوو بە ڕۆژ لە کاری زێدە تەلەفۆنەکان لە لەبەردەم تەختەی تەلەفۆنەکان لە وەرزی کشت‌وکاڵو بەرخ زایین ئەباتەسەر ، ئەلێرە تا دواڕۆژی برینگە کاردەکا .

لەبەرئەوەی کرێی بۆ هەر دانەیەك ئەدرا جا ئەیتوانی هەندێ دراو وەدەس‌بێنێ ، لەبەرئەوەی پێویستی بێوەژنی سەربازەکەبو ، پێویستە بەهەر کوبیکێك هەبو . ڕاستە خێزانەکەی بچووکە – خوی‌و کوڕەکەی – هەر چۆنێ بێ‌خێزانە پێویستی بەکۆکردنی دار هەیە بۆ زستان هەروەها ئارد بکڕێ پێش ئەوەی نرخی بەرزبێتەوەو کەل‌وپەل پێلاوو شتی‌دی .

کەسێ نەبو منداڵەکەی لە ماڵ بۆ بەجێ‌بهێڵێ ، جا لەگەڵ خۆی ئەیبردەسەر کار ، بەدرێژایی ڕۆژ جل‌چلکن‌و لە لووتکەی کامەرانیدا لە نێوان کرێکارانی برینگەچی‌و

چیرۆکی : جەنکیز ئیتماتوف
وەرگێڕانی : فاتح محمد شریف

ـــەگە تەڕو
شـــوانەکانو ســـ
خۆلاویەکانیان ئەهاتو ئەڕۆیی .
بەکەم کەس بوو عارەبانەی فلیم
پشـــاندەری ئەچێنـــە ناو هۆلی
پشتیرەکەوە بەکـــەم کەس بو ئەو
هەواڵە خۆشەی بەڕاکردن گەیانـدە
هەموان سینەما گەیشت سینەما .
تاریکایی داهاتو پاش کارکردن
فلیمەکە دەستی پێکرد ، پێش ئەوە
هەســـتی بە ناخۆشی چاوەڕێیی
ئەکرد بەلام پاداشی چاوەڕەیکردنە
ناخۆشـــــەکەی درا ، فلیمەکە
دەربارەی شەڕبو ، لەســـەر پەردە
سپیەکە کە راکیر کرابو لەنێوان دوو
کۆلەکە لە بن پشتیر کە شـــەڕ
دەسی پێکردو تەقەکـانیش دەنگیان
دابەوە ڕۆکێتەکـانیش دەربازبونو
فیکەیان لێئەدا تاریکایی هەلایسا .
گوللەی ڕۆشـــنکەرەوە بەزەوی‌دا
ئەنووسی، پێش ئەوەی ڕۆشنایەکەی
بکوژێتەوە یەکێکی دی بۆ پێشـــەوە
دەرئەچو . تۆپەکانیش لەشـــەودا
گرمەیان ئەهات منداڵ هەستی بە
ترس ئەکرد .
ئەوە شەڕبو .
لەگەل دایکی لەســـەر بالاتی
خوری لەپشت هەموانەو کە دیتنی
لێوە باشتربو دانیشت . ڕاســـتە
حەزی لێبو لە ڕیزی پێشـــــەوە
دابنیشێ لەو شوێنەی منـــدالانی
کێلگەی فەرمانڕەوایی لەتەك پەردەکە
لە سەر زەوی دانیشتوون . هەولدا
ئەکان بداتـــە لایـــان بـــەلام دایکی
ڕایکێشاو وتی :
**بەسیەتی : لـە بەیانییەوە تـــا**
**ئێوارەدێیتو ئەچی . لەســـــەر**
**هەردوو ئەژنۆی خۆی داینا .**
ئا مێری پێشاندەر دەنگی لێوە
هاتو ئاشی شەڕ سوڕایەوە خەلکی
بەنیگەرانییەوە ســـەبریان ئەکرد ،
دایکی بەدەنگێکی بەرز هەناســـەی
گرانی ئەکێشا هەر ئەختاو ئەختێك
ئەلەرزی منداڵەکەی بەتوندی لـــە
ئامێز ئەگرت . ئەو کاتەی تانگەکان
ئاگریان بەرەو ڕووی ئەهاوێژت لـە
بەردەمیا ئافرەتێ لە سەر بالاتەکـان
دانیشـــتبو هەر دەنگو منگەمنگی
لێوە ئەهات :
**ــ خودایـە . چی ڕوونـەدا !**
**خودایە .**
بەلام ئەو زۆر نەئەترســـا
بەپێچەوانەوە هەســـتی بەخۆشی
ئەکرد کە ئەیبینی فاشیەکان بەر
ئەبنەوە : ئەو دەمەی ســـەربازە
ڕووســـەکان ئەکەوتن وایئەزانی
ئەختێتر لە نوێوە هەلئەستنەوە .
بەڕاســـتی دیمەنی خەلکی
ئەوکاتەی لە شەڕ ئەکەون خۆشـــە
هـــەروەکو خۆیان - منالەکـان -
ئەکەون ئەوکاتەی باری شـــەڕ

ئەکەن . ئەتوانێ بەرێوە خۆی بخا هەروەکو یەکێ بیخاتە داوەوە . ڕاستە چنجرك ئازاری پێئەگەیێ . بەلام چیزیانی تێدایە ؟ ئەوەتا هەڵئەستێتەوەو ئەگەرێتەوە بۆ هێرش‌بردن هەموو شکانێکی لەبیرچوو .

بەلام ئەمانە هەڵناستنەوە ، بەردەوامن لە پالکەوتنیان لەسەر زەوی وەکو گردی بۆر لە شوێن خۆی ناجولێتەوە . ئەتوانێ بەباشی بەشێوەیەکی دی خۆی بخا هەروەکو ئەوانە گوللەیەك لەسکیان ئەکەوێ . ئەمانە یەك سەرناکەون بەلکو دەس‌ئەگرنە سکیان دوایی ئەچەمێنەوە ، نەختە نەختە ئەکەونە سەر پووش‌و چەکیش لە دەستیان بەرئەبێتەوە ، پاشان ئاشکرای ئەکا ئەکوژراوەو لەنوێوە ئەگەرێتەوە بۆ شەڕ بەلام ئەمانە ئیدی هەڵناستانەوە .

**شەڕ هێشتا هەربەردەوام بو ئامێری پیشاندەر هەر دەنگی لێوە ئەهات پیاوانی تۆپچی لەسەر پەردەوە دەرکەوتن . چەکەکەیان پال‌ئەنایە سەر گردەکە بەرێی ئەم یالە درێژو پانەکە کە خەریکە بگاتە گەوالەی ئاسمان . بەرێی ئەم یالە درێژو پانە کە پرە لە قۆرتی بۆمباکان ئەم برە تۆپچییە دەستی بە جوولە کرد . لە جوولەیانو ڕوخساریان ئەکرایەوەو پر ئەبو لە شانازی‌و ژانو چاوەڕێکردنی هەر شتێکی ترسێنەرو مەزن .**

ژمارەیان ئەگەیشتە حەوت زەلام بەرگەکانیان سووتابوون‌و ڕوخساری یەکێکیان لە ڕوخساری ڕووسی ئەئەچو ، منداڵەکە هیچ گوێی نەئەدا ئەگەر دایکی نەیچپاندایە گوێی :

**— سەیرکە ئەوە باوکتە ....**

لەوکاتەوە ئەم زەلامەبوو بەباوکی پاشماوەی فلیمەکە هەموو دەربارەی ئەو بو — باوکی — باوکی گەنج‌و هەروەك گەنجەکانی کێلکە فەرمانڕەوایی‌یەکە ، زۆر درێژ ئەبو ڕوویەکی خڕی هەبو دووچاوی بە لەز چاوەکانی ئاگریان لێ‌هەڵئەچو لە ڕووی ڕەشبو بە هۆی کادوو و قوڕەوە . هەروەك پشیلە سقك‌و گوستاخ بو ئەوەتاتایەی تۆپەکە بەشانی هەڵئەگرێ پاشان ئاو ئەداتەوە هاوار ئەکاتە یەکێکیان گوللەکان بەپەلە بێنە . بەلام دەنگی لەگەڵ تەقینەوەی گوللەیەکی نوێ نێژرا .

دایە ئەمە باوکمە ؟ ئافالییك لە دایکی پرسی .

چی ؟ — دایکە تێنەگەیشت . لەسەر خۆ دانیشەو سەیرکە . پێمت‌وت ئەوە باوکمە .

**بێ‌گومان باوکتە بەلام قسەمەکەو ئەوانی دیش سەخلەت مەکە .**

**بۆئەوەی پێ‌وت ؟ لەوانەیە بێ‌بیرکردنەوە یان ڕووداوەکانی** فلیمەکە جەخارەکانی وروژاندبی‌و مێردەکەی خستەوە بیر ، بڕوای بەقسەی دایکی کرد . شادی لە دەروونی بلاو بوو هەستی بەشەلەژان کرد لەم شادیە چاوەڕوان نەکراوە کە پێش ئێستا نەی چێژتووەو هەستی بە شانازی بە باوکی سەرباز کرد باوکێکی ڕاستەقینەیە ! باوکییەتی ، کەچی منداڵەکان بە بێ‌باوك ناوی ئەبەن دەبا ئێستا باوکی ببینن‌و . دەبا شوانەکانیش ببینن .

ئەم شوانانە شاخەکان گر ئەخۆن ناوی منداڵەکان ناکەوێتە بیریان ئەمیش لە مێکەل دانەبەر باریدەیان ئەدا بۆناو پشتیری برینکە . ئەو دەمەی سەگەکانیان بەشەڕ دێن دەریان ئەکا ، ئەوانیش ڕێژنەی پرسیارەکانیان ئەبارێننە سەری هەر شوانێ . لەم جیهانە چەندە زۆرن ، ئەم پرسیارەی لێ‌ئەپرسن :

**— ئەی غولام ناوت چی‌یە ؟**

**— وافالییك ..**

**— کوڕی کێی ؟**

**— کوڕی توکتوسون .**

بۆ یەکەم جار شوانەکان نازانن منداڵەکە مەبەستی چی‌یە ئەچەمێنەوە سەر زینەکەو ئەپرسن :

— توکتوسون ! توکتوسون کێ‌یە ؟

— منداڵەکە لەنوێوە دووپاتی ئەکاتەوە : من کوڕی توکتوسونم .

دایکی فەرمانی پێداوە بەمە وەلام‌بداتەوە . بەلام داپیرە کوێرەکەی داوای لێ‌کردووە ناوی باوکی لەیاد نەکا هەردوو کوێچکەشی لەبەر ئەوە گرتووە .

چەند چەتوونە .....

ناە چاوەڕێکە ، چاوەڕێکە ، تۆ کوڕی کرێکاری تەلەفۆنی وا لە پۆستەکار دەکا وانییە ؟

**نەء من کوڕی توکتوسونم ، منداڵەکە بەرقەوە پرسیارەکەی دووپات‌کردەوە .**

ئەوجا شوانەکان لە ڕاستی باسەکە تێ‌ئەگەن . ڕاستە تۆ کوڕی توکتوسونی ئافەریم ، تووڕەمە بە ویستمان تاقیتکەینەوە ئەی خولام ئێمە سال لە شاخەکان ئەبەینەسەر بەلام ئێوە وەکو گیا سەوز ئەبن ،

ئەستەمە هەموو منالەکان بناسین .

باشان شوانەکان بەهێواشی‌یەوە بەدرێژی قسە لە باوکی ئەکەن چۆن لە هەرەتی لاوی‌یەوە چو بۆ شەڕ ، زۆریان ئیستاکێ لە بیریان کردووە خۆش بەختانە کوڕێکی لێ‌بەجێ‌ما چەندین گەنجان پێشـــــئەوەی شایی‌بکەن چوونە شـــەڕ هیچیان بەجێ‌نەهێشت ناویان هەلبگرێ .

**ئێستا . لەو خولەکەوە دایکی چریاندیە گوێی « سەیرکە ئەوە باوکتە » سەربازەکەی سەر پەردەکە بوو بەباوکی . هەرواشە تاڕادەیەك لەو وێنە سەربازی‌یەی باوکی ئەچو ـ سەربازە گەنجەکە لەجلو بەرگی سەربازی‌دا ، ئەو وێنەیەی گەورەیان کردووەو لەچوار چێوەیان ناو لە جامیان خست .**

بەلام لەوکاتانە ئافالییك بە دوو چاوی کوڕێتی سەیری باوکی دەکرد شەپۆلێکی گەرم لە خۆشەویستی دروستکراوو نەرمی‌و سۆزگیانی ڕامالی . لە سەرپەردەکە باوکە کە وادیار بو . وەك بلێی ئەزانێ کوڕەکەی سەیری ئەکا ، وادەرکەت وەك بیبەوێ لەلای کوڕەکەی شەقلێکی سەقامکیر بەجێ‌بهێلێ شانازی پێوە ئەکا وەك سەربازێ چووبێتە شەڕێکی سەختی ڕابردو . لەوکاتەوە شەڕ لەلای خۆش ئەبو شتێکیش نەما ببێتە هۆی پێکەنین بەو شێوەیەی خەلکی پێی‌ئەکەون . شەڕەکە بو بە تەواوو پۆتەو ترسێنەر .

بۆ یەکەم جار هەستی بەترس‌کرد بۆ کەسێ خۆشی ئەوێ . کەسێ بۆ هەمیشە ووتی کردووەو هەست بە سۆزێکی بەتینی ئەکا بۆی .

ئامێری پیشاندەر بەردەوام بو لە دەنکی ، ئاشی شەر لە سوڕانەوە بەردەوام‌و لە پێشـــەوە تانکە هێرش‌بەرەکان دەرکەوتن . ترسیان ئەخســـتە دڵ ، بە زنجیرەکانیان زەوی‌یان ئەشێلاو کەلوکانیــان ئەسوڕاوەو لە تۆپەکانیان بەدەم ڕێگاوە ئاگر دەرئەچو : بەلام پیاوانی تۆپچی هێشتا تۆپەکە بەرەو سەرەو ئەبەن هەر ئەوەندە نییە لەشەکە تابکەون منداڵەکە پەلەی لە باوکی ئەکرد « دەی ، دەی ، باوەتانکەکان هاتن ، تانکەکان » .

لە کۆتایی : تۆپەکە گەیشـــتە لووتکە لە نێوان بێشەلانێ لە داری فنـــدق ئاگر بە ڕووی تانکەکـــان کرایەوە ، ئەوانیش دەســـتیان بەئاگر فرێدان‌کرد . ژمارەیان زۆر بو هەلوێستەکە ترسێنەربو .

**منداڵەکە واهەستی ئەکـــرد بەخۆی لەوێ‌یە ، لەگـــەڵ باوکی لەنێوان ئاگرو بروسکەی شــــەر ڕانەوەستێ لەسەر ئەژنۆکانی دایکی بازی ئەدا ئەوکاتە ئاگر لەم یالـــەو تانکە هەلئەساو کادووی ڕەشـــی لێوە بەرز ئەبو ، ئەوکاتـــەی زنجیرەکانیان لەتایەکان جـــوێ ئەبووەوە کوێرانە لە شوێن خۆیـان ئەسوڕانەوە ، بەلام ئەودەمـــەی سەربازەکانی تەك تۆپەکە ئەکەوتن ئەنووشتایەوەو کز ئەبو . ژمارەیان ئەختـــە ئەختـــەکـــەم ئەبو ... بەلام دایکی ئەگریا ، دەموچاوی لە فرمێسکا گەرموتەڕ بووبوو .**

ئامێری پیشاندەر بەردەوام‌بو لە دەنکی ، شەڕ بەردەوام بو توندی کوشتار زیاتربو تانکەکانیش ئەختە نزیك ئەبونەوە . لە نزیك عارەبانەی تۆپەکە باوکەکە چەماوە بەتونـــدی لەســـەماعەی تەلیفونی مەیدان هاواری‌کرد بەلام هاوارەکەی لەنێوان دەنکی کوشـــتارا وون بـو سەربازێکی‌دی لە تەك تۆپەکـــە کەوت ، هەولی هەستانی‌دا ، بەلام ئەیتوانی ، کەوتە سەر زەوی کە بە خوێنی ڕەنکی دابۆوە تەنهـــا دووکەس ما ـ باوکەکەو سەربازێکی دی گوللەیەکیان هاوێشـــت دوای دووی‌تر یەك لە دووای‌یەك ، بەلام تانکەکان بەردەوام بوون بۆ پێشەوە. جارێکی دیش بومبێکی دی فیکی‌کرد لە تەك تۆپەکە تەقییەوەو بلێسـەی ئاگر بەرزبۆوە . لە سەر زەوی تەنها یەك کەس هەست ، باوکی‌بو . لە نوێوە بەرەو چەکەکە تەکان ئەداو بەخـــۆی پری ئەکاو بەخـــۆی سێرەئەگرێ ، ئەوە دووا گوللەبو ، لەنوێوە پەردەکە تەقینەوەیەکی دی ئەداتەوە تۆپی باوکەکە تەشـــکێنێو خـــۆشی لە دوور ئەکەوێ ، بەلام هێشتا هەر زیندووە ، بەگرانی لە زەوی هەلئەستێتەوە ، بەو بەرگـە دووکـــەلاوی‌یە لەبەری ماوە بەرەویەکێ لە تانکەکان ئەڕوا نارنجۆکێك لەدەســـتی . نەهیچی ئەبینی‌و نەهیچی گوێ لێ‌ئەبو . هەولی ئەدا هەر هێـــزێکی تیابێ کۆی‌کاتەوە .

نارنجۆکەکەی ڕاتەکانو هاواری‌کرد .

ــ ڕاوەستە ، نارۆی ! لـــەم ژیبوارە ئەختێ لە شـــوێن خۆی ئەمـــەبێ ژان‌وکینـــە دەم‌وچاوی تێك‌داوە جینجول دەستی کوڕەکەی بەتوندی گوشی .

ئەیویست دەرباز بێ وتەکـــان بەرەولای باوکی‌بدا بەلام ڕیزێ گوللە لە تانکەکەوە دەرچو ، باوکەکە کەوت هەروەك داری براو ئەکەوێ. لە سەرزەوی گلۆربۆوە . ویستی

هەستێتەوە بەڵام لەسەر پشت کەوتەوە بەڕاکشاوی مایەوە دوو دەستی درێژکرد .

ئامێری پیشاندەر کپ بو شەریتی شەڕپچڕا . ئەوە کۆتایی بەکرەکەبو ، کرێکاری هونەری ڕوشنایی هەڵکرد تا بەکرەیەکی دی بخاتە سەر ئەو کاتە ڕۆشنایی پشتییرەکەی گرتەوە . پێڵوی هەموان توشی تروکانی بەلەز بو لە جیهانی سینەماوە ئەگەڕانەوە ، لە جیهانی شەڕەوە بۆ ژیانی ڕۆژانەیان، لەمکاتە منداڵەکە لەسەر بالاتی خوری گلۆر بۆوە و هاواری کرد :

— ئەوە باوکم بو : نەتان بینی : باوکمیان کوشت ......

**کەس شتێکی وای چاوەڕوان نەبو ، کەسیش نەیتوانی لە ڕاستی ڕووداو تێبگا ، بەڵام منداڵەکە بەرەو پەردەکە ئەڕواو هاوار ئەکا هاواری سەرکەوتن بۆئەو شوێنەی هاواڵەکانی دانیشتوون کەڕایان لەلای ئەو ڕای یەك لای بو ، بۆ ماوەیەکی کورت کپییێکی ترسێنەر پشتییرەکەیدا گرت ، بۆ یەکەم جار خەڵکی هۆی شادی ئەم منداڵەی نەزانی کە تائێستا باوکی خۆی نەدیوە . کەسێ نەبو تێبگا ، پەنایان بردە کپیو بەشەلەژاوی شانی خۆیان هەڵئەتەکان . بەکرەی شەریت کەوتەنەوەی بەڵام کەس کوێیئەدایە ، تاکو کریکاری هونەری یەکەش نەچەماوە هەڵگرێ .**

بەڵام خۆی ، سەربازە بچوکەکە، کوڕی سەربازی شەهید ، بەردەوامبو دووپاتیکردەوە :

— بینیتان ئەوە باوکمە ! ... کوشتیان ! پرکێشییەکەی زیاتر ئەبو کە ئەیبنی خەڵکە کە لە کپی خۆیان بەردەوامن تێ نەگەیشت بۆچی بەشداری شادیو شانازییە کەی ناکەن بەباوکییەوە .

یەکێ لە گەورەکان بەسەرکۆنەوە وتی :

— وس – کپبە – قسەی وامەکە .

بەڵام یەکێکیان بەرهەڵستی کرد :

— چیتیایە ؟ باوکی لەبەرە شەهید بووەنییە ؟

ئەوجا یەکێ لە قوتابیەکان ئازایەتی خۆی کۆکردەوەو ڕاستی بۆ دەرخست .

— باوکت نییە ، ئەم هاوارە لەچی ؟ باوکت نییە ، ئەکتەرە

برۆ لە کرێکارە هونەریەکە بپرسە .

هیچ کەسێ لە گەورەکان نەیئەویست ئەم ئەندێشە تاڵو جوانە لە منداڵەکە دەرکا ، جا ئەیانویست کرێکارە هونەرییەکە – کە نەناسە لە کێلکەکە – بەمکارە هەستێ . هەموو ڕوویان کردە ئەو. بەڵام ئەویش پەنایبردە کپی . خۆی بەئامێری پیشاندەر خەریكکرد .

— سەربازە بچوکەکە کۆڵی نەدا :

**— نەخێر ، باوکمە ، باوکم .**

— لەسەر نەوەیەکێ لە منداڵەکان لێیپرسی :

— باوکت کێیە ، کێ ؟

**— ئەوە بو بەرەو تانکەکە تەکانیدا نارنجۆکی هەڵگرتبو ، نەتدی ؟ ئاوەها کەوت .**

منداڵەکە کەوتە سەر زەوی گلۆربۆوە ، هەروەکو باوکی کەوت . لە تەك پەردەکە لە سەرپشت ڕاکشا دوو دەستی درێژ کرد .

بەتەرزێکی نەویست سەیرکەرەکان پێکەنین ، بەڵام ئەو ڕاکشابو وەك بڵێی مردووە ، بێئەوەی پێبکەنێ ، دیسان کپی هەمووی داگرت .

ئافرەتێکی بەساڵاچو – شوانە – دایکی سەرکۆنەکرد :

— ئەوە چییە ، جینجول چیت لێکرد ؟

دایکەکە بەکەسەرەوە ڕێی خۆی لە نێوان خەڵکی کردەوە فرمێسکیش لە چاوانی ئەهاتە خوار .

کوڕەکەی لەزەوی هەڵگرت :

— دەی کوڕم ، دەی ، ئەوە باوکتبو ، ئەمەی بەهێواشیبەکەوە وت ، پاشان بردیە دەرەوەی پشتییرەکە .

مانگ بەرز ئەبۆو ، لە ئاسۆو ، لووتکەی بەندەنەکان چریسکەی سپی ئەدایەوە لەپشت ئاسمانی بۆرەوە لە خواریشەوە نەرمایی بە درێژایی چاویان ئەبۆوە .

ئێستا بۆ یەکەمجار لە ژیانی هەستی کردشتێکی زۆر ئازیزی ونکردووە . لە ناکاو کینەو کەسەرو ژان ڕایماڵی لە پێناوی باوکی کە لە شەڕ شەهید بو هەستی بە ئارەزوویەکی بەتینکرد دەس بخاتە ملدایکیو بگری ئەویش بەشداری بکا بەڵام ئەوکپبو ، هەردوو مستی خۆی گوشی بەکپی قینی لە فرمێسکەکانی هەست .

نەی ئەزانی باوکی کە لە مێژە لە شەڕ شەهید بوە لەوکاتەوە لە ناخیا ئەژێتەوە !




# نەك سواری

عبدالرقیب یوسف

برای بوێژ کاك عبدالرحمن مزوری د پاشکوێ « عیراق » دا ژمارە ١٩٨٠/٤٠ هەلبەستەك یا شاعرێ کورد « سەوادی » بەلاو کردوە ناونیشانی : « ئەو هوزانا سواری یە » و ئەو هەلبەستەش وکو بلاو کردی ٢٢ دیرە و پیشیاوێ ئەمەیە :

**ئەی فەلەك دیسا تە کولکر دەردو نیشانێ دمن**
**مثلێ بلبل مەیلێ گول کر زەهرو ئەفغانین دمن**

تێدا باس کردوە کە هیچ سەرچاوەیەکی میژووی و یان ئەدەبی ناوی ئەم شاعرە نەهیناوە تەنیا عبدالرقیب یوسف ناڤێ وی هیناوە د هاوکاری دا ( ژمارە ٤٢٤ روژا ١٩٧٨/٥/١ ) د گوتارەکدا لە ژێر ناونیشانی : « لەیلاو مجنون یا هوزانڤانێ کورد سەوادی » .

یانی بە پتی « دال » بەلام کاك عبدالرحمن « سواری » بە راسترزانیوە لەبەرئەوەی کە بەم جۆرە ئەم ناوە هاتوە یانی بە پیتی « رێ » لەو هەلبەستەیدا لە کەشکولی شێخ طاهایێ سەرنی دا کە برێك هەلبەستی چەند شاعرێك تێدا یە .

سالی رابوردو پاش ئەوەی من ئەم هەلبەستەی سەوادی بو گوڤاری ( بەیان )م نارد و لە ( ٣٠ ) دێرپێك هاتبوو لە ژمارەی (٦٧) بەیان دا سالی ١٩٨٠ دا بەلاو بو ـ نامەیەکم بو کاك عبدالرحمن نوسی باسی ئەم هەلبەستەشم کرد کە یێ سەوادی یە و ئەم زانی کاك عبدالرحمنیش

چەند دانەیێك لێ كۆكردوە نامەیەك بو منی ناردو ئەلی : بەلگەكانت چیبە كە ئەلی « سەوادی » منیش ولامی نوسی بەم دیارە برادەر قەناعەتی پێ نەكردوە و ئێستا پێویستە زیاتر رونی بكەین بو ئەوەی ئەم خەلەتە بەلاو نەبێ . وئەو بەلگەی بە دەســـتێ نیمەوەیە ئەمەیە .

**ناوی ئەم شاعرە كوردە بە ووشــــەی « سەوادی » یەوە هاتوە دكتێبە دەستنوسەكەیدا « لەیلا و مەجنون » كە بە كرمانجی ژورو لە سالی ( ١١٧٢ ك = ١٧٥٨/١٧٥٩ زا ) و یان ســالی ( ١١٦٢ ك ١٧٤٨/١٧٤٩ زا ) دا هونراوە ســێ دانە لــەم دەستنوسە لە لام هەیــە دویان بــە فوتوكوپیرەیە لە هەمویاندا لە دوو ویان ســێ جیگەدا « ســـــەوادی » بەپیتی « دال » نەك « سواری » بەپیتی « رێ » هاتوە هەر دانەیێك لە ناوچەیێك یێ كوردستانی توركیەدا هـاتــوە نوســین :**

١ ـ دانەیێ رمضان رشید شكەفتی لە مەدرەسی ( حسینان ) لە ناوچێ ( فارقین ) لە ولایەتی ( دیار بكر ) لە ســــالی ( ١٣٥٥ك )دا نوسراوەو بەدەستی رمضان ...

٢ ـ دانەیێ سراج الدین كە لە سالی ( ١٩٦٣ )دا نوسیوە لــە گوندێ « دكیە » لە روژئاوایێ جزیرا بوتان .

٣ ـ دانەیێ محمدێ كال كورێ شیخ نوری لــە سالی ( ١٣٨٧ ) زا دا نوســیوە بو فەقی عبداللە آزر كە عبداللە لە تطوان دادنشــێ لە ناوچێ ( بدلیسێ ) لە قەراغێ دەریاچەی وان .

**ئەمە ئەو دێرانە یە :**

١ ـ « ای حضرة پیشــــوای مختار
ناچارە ســــــوادیی گنهكار »

ئەمەش د ( بنـــدی ثانی ) دا هاتـوە بەپێ دانەیا سراج الدین ( مەلا سراج الدین كورێ مەلا عبدالحكیمێ خەلیلی كە شـــــاعرو زانایە ) .

٢ ـ دیری هەفتەم لە كوتایی كتیبەكەدا :
« یا رب بــــوادی جگرخون
آزاد بكی ببخشـــی مجنون »

٣ ـ هەر د ( بنـدی ثانی )دا كـــە دەربارەی وەسفی پێغەمبەردا بە (٩) دێر لە پێش ئەو دێری نمرە (١)دا وهایە :
« بێ طرفو جهاتو بێ سروبن
من بعد مَبی ســــواد بو من »
بەپێ دانەیا شكەفتی .

سراج الدین لە تەنشت ئەم دێرە نوســیوە « ای مؤلف الكتاب » .

وها دیارە نێ جار ناوی شاعر ( ســواد )ی بە پیتی « دال » نوســراوە لەم سێ دانەیەدا . لە دانەیێ سراج الدین دا جارێكی تریش نوسراوە بەلام بەقەلەمی رساس لەم عبارەتەیدا كە لـــە كوتایی كتێبەكەیدایە یان بلێێن لەدەستنوسەكەیدا :

**« تمت المختصرة المنظومة بالكردي من قصة مجنون وليلى على يد احقر العباد سوادى قــد حررها لاجل لوء لوء عمان الوزارة عبدالله پاشا ».**

دورنیە ئەم عبارەتە یێ دارنەری كیبەكەیێ وعبداللە پاشا ئەو پیاوە گەورەیەبێ كـــە لــە ( بند ثالث ) دا شاعر وەسفی داوە وكتیبەكەی بو ئەو دانیوە نیتر ئەگەر ( میر عەبدال )ێ جزیری بێو یا میرەكی تربێ بە تەواوی بومان تائێســـتا رون نە بوە .

من نامەم نوسی تـا بزانم بوچی نیرەدا ناوی شاعر بەقەلەمی رساس نوسراوە ئایـا هەر لـــە پێشدا هەبوە یانی لەو دانەیەدا كـە سراج الدین دانەیا خوی لە بەری نوسیوە و لــە بیری چوەو پاشی بەقەلەمە رساسەكەی نوسیوە ویان هەر لە لای خویەوە نوسیوە .

ولامی سراج الدین ئەوە بو كـــە هەر وا نوسیوە وكو لە دانەی پێشو دا هەبوە .

ئەوی بابەتی گوتنە د دانەیا شـــكەفتیدا « سەوادی »بە چونكە زیروزەبەر كـــردوە یانی « سەر » ( فتح ) لە سەر پیتی ( سین )ێ نوسیوە و ( كسر ) لە ژێر دالێ بەلام دانەیا محمدێ كال « سوادی »بە چونكە « بەر » یانی ( ضم )ە لــە سەر ( سین )ێ نوسیوە ... بەلام سراج الدیـن زیرو زەبەری نە كردوە بەلام یاراست وەكو یـــا شكەفتی یە .

هەروەها ( عبدالعزیزێ عەلەوی )یش ناوی

شاعر لە دێری دوایی لە هەلبەستەکەیدا بە « سەوادی » بە پیتی دال خوێندوەو بە دەنگی وی لە لام هەیە کە چەند جارێك لە ئێسکەی ( قەسری شیرین )ەوە خوێندوە وهەر ئەو دانەیە بو کە من بەلاو کردوە چونکە راسترو بترە لە هەموو دانەکانیتری کە لە لام هەیە وئەو دانەکانی تریش کە کاك مزوری دیتوە چونکە (٢٠) دیرە .

ئیتر راست نیە ئەگەر ئێمە چاوی لەم هەمووە بپوشینین وبلێین ناوی « سواری »یە کە تەنیا لە یەك جێگەدا هاتوە نوسین ولە یەك کەشکول دا کە بە خەلەتی‌ نوسراوە .

هەروەها کاك عبدالرحمن « سواری » راستر زانیوە چونکە ئەلێ ووشەیەکی کوردیە و ئەلێ « سوارێ » دێیەکە لە بەرواری ژێری و ئەلێن نازانین ئایا خەلکی وێیە یان نا ؟ .

بەلی مامۆستا دکتور معروف خزنەداریش لە کۆڤاری ( روژی کوردستان ژمارە ٤٩ سالی ١٩٧٨ )دا رەخنەیەك بەلاوکرد لە سەر ئەو مقابلەی کاك ابراهیم عەلی مەحمود کە لەگەل منیکردبو لە روژنامەی العراق دا روژی ١٩٧٧/١/١٧ دەربارەی دستنوسەی « لەیلا مەجنون » و خەلەتیك پی خومان راستکردبو خەلەتەکەش ئەوەبو کە نەمان زانیبو ئەم دەستنوسە لە یەکیتی سوفیەت چاپکراوە بە ناوی « حارث البدلیسی »یەوە کە دورنیە ناوی سەوادی پی مامۆستا دکتور معروف نوسیبو کە هیچ شاعریکی کورد بەناوی « سەوادی » وە نیە « ... بالرغم من عدم امکانیة اقناع احد بوجود شاعر کردی یجعل من هذه الکلمة الغریبة « سوادی » اسما ولقبا » .

و لەلای وایە ئەگەر هەبیش ئەبی « سواری » بی بەلی دیارە لەکاتی دکتور ئەمە وتویە ناوی « محوی » نە نازناوی شاعریکی کوردی خەلکی سلیمانییە نەهاتووە بیری ئایا « سەوادی » لە « مەحوی » ناخوشترو تالترە ؟

ل ولامی کاك عبدالرحمن و دکتور دا ئەلین ووشەی « سەوادی » غەریب نیە کوردیدا بەلکو زۆر بەکار ئەهێنری لە ناوچەکانی باکوری لە کوردستاندا لە ناوچەی بدلیس و موش و مەلازگرو ئەزەروم و وان و هەتا قەرس و بازیدیش وەکو ووشەیەکی کوردی لیهاتوە ئەلێن فلانکەس ( خودان سەوادە ) یانی خوێندەوارەو ( فلانکەس بی سەوادە ) یانی نەخویندەوارە و بی ( علم )ە .

زانای مەزن ( ئەحمەدی خانی )یش ووشەی «سەواد» بەم مانایە بەکارهێناوە لە قاموسەکەیدا : « نوبهار – نوبهارا بچوکان » لە پیشەکیەکەیدا ئەلێ :

**« وەکی ژ قورئانێ خلاص بن**
**لازمە ل سەوادێ چاف ناس بن »**

ئیتر نازناوی : « سەوادی » لەم ووشەیە هاتوە .

ئەگەر ئەم بلێین « سوارێ » دیەکە لەناوچی بەهدینان دا ئەبی بزانین کە « سەوادی » ناوی دیەکی سی چل مالەیە لە روژئاوا و نیزیك « فندك »ێ ل ( بوتان ) بەلام پیناچێ ئەم شاعرە خەلکی ئەم دیەبی چونکە « لەیلا مەجنون » بەشیوەی ( بوتان ) نیە و بەشیوەی ناوچەکانی ژورووە ئیتر دێ « سوارێ » لە کوێیە .

ئەوی بابەتی گوتنە « سەوادی » نازناوی شاعرەك و یان دو شاعری ئێرانییە ئەمەش لەسەرچاوەیکم وەرگرتبو ئەگەر چەند ئێستا لیم بزربوە بەلام دورنیە بکەوی بەرچاوی هندیك لە خوێندەواران و دور نیە ئەم شاعرویان دو شاعرە نازناوی خویان لە ووشەی « سەوادی » کە بەمانای ( لادێیی ) وەرگرتبن چونکە : ( قریاتی ، سوادی ، رستاقی ) هەرسی بەیەك مانایەو هەریەك لە ( اقلیم )و یان هندەك ( اقالیم ) دا بەکارئەهێنری وکو ( فاعل و روزکاری ) و هەروکو ( حصن ، قهندز ، کلات ( کەلات – قەلات ) هەروکو ( مقدسی ) کومەلێك لەم ووشانە هێناوە لە کتێبەکەیدا « احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم » ل ٣٠ – ٣١ چاپی لیدن ١٩٠٦ .

ئەگەر چەند ئەم قسەی دوایی ئێستا ززولاوازە لەبەر ئەوەی کە ئەو سەرچاوەم لیبزربوە بەلام ئایا ئەبی شاعری مە نازناوی خۆی لە پی ئەو شاعرە یان ئەو دو شاعرە وەرگرتبێ ؟

ئەڵماس خان یەکێکە لە شـــــاعیرە پایە بەرزەکانی کوردستانی ئێران ، شـــــاعیرێکی بەتواناو بلیمەتو بیرتیژو پایەبەرزی ســـــەردەمی خۆیەتی . لە سەدەی هەژدەهەمدا لەســـەردەمی نادر شادا لە ئاوایی « گەنۆڵە » هاتووەتـــەڕوی جیهانەوە ، دێی ناوبراو دەکەوێتە نێوان شاری سنەو کرماشـــوە . زۆرجار توشی ئەشکەنجەو بەندیخانە بووە لەسەردەمی ڕژێمی پاشـــایەتی گەندەڵی ئەو سەردەمەدا .

شاعیر بەناوبانگە بەم ناوانەی خوارەوە :ـ
میرزا ئەڵماس خان ، سەرهەنگ ئەڵماس خان ، خان ئەڵماس ، خەلیفە ئەڵماس ، مەلا ئەڵماس خان .

گەلێ شـــــیعری هەمەجۆری هۆنیوەتەوە بەشێوەی « گۆران » وەك ڕامیاری ، ئامۆژگاری ، پەند ، ســـۆفیگەرێتی ، ئەوینی وەچەنـــد چوارینەیەکی هۆنیوەتەوە بەشێوەی ســـۆرانی هەوشاری وە هەروەها ئەم کتێبانەیشـــــی نوسیوەتەوە هەفت لەشکر ، نادرنامـــە ، بارام‌و گوڵەندام ، حەسەن‌و حوسێن ، قەندیل‌و قەلا ، ڕوستەم‌و زۆراب ... هتد .

چەند کتێبی لەو کتێبانەو لەگەڵ کۆمەڵێ لە بەرهەمەکانی بەدەســـتم گەیشـــت هەمویان دەستنوسن ، بە دەستو قەلەم خوا لێخۆش‌بو مەلا عەباس حیلمی‌و ســـــەید عـەلی ئەغــە نوسراوەتەوە .

لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی ـ مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە بەشی باخچەی شاعیراندا لە لاپەڕە ( ٢٦٩ )ی‌دا ناوی بردووەو دەڵێ لـــە ساڵی ١٧٦٢ی‌ز . دا شاعیر لەنوسینی نادر نامـە بووەتەوە ، زۆر بەداخەوە تا ئێســـتا بەرهەمە نایابەکانی بەچاپ نەگەیشتون .

لێرەدا بەپێویستی دەزانم‌و داوا دەکەم لـــە هەموو ئەدیب‌و ئەدەب دۆســـت‌و ئەوانـەی کەوا بەتەنگ ئـەدەب‌و کـەلـەپووری کوردی‌یەوە دێن هەرشتێك دەربارەی سەرگوزەشتەی میـــرزا ئەڵماس‌خان‌و بەرهەمـەکـانی لایانەو دەیـــزانن بەهانامانەوە بێن ، ئێمەو مێژووی نەتەوەکـــەمان بەوپەڕی دڵسۆزی‌و شانازی‌یەوە ســـوپاسیان دەکەین‌و ڕێزیان لێ‌دەگرین ، تاکو بتوانین بەهەموو لایەکمانەوە بەرهەمەکەی ڕزگار بکەین‌و لەچاپی بدەین کە تا ئێستا بەخسیری سەندوقە کـۆن‌و کتێبخانە تایبەتیەکانن .

وا بۆ نموونە چەند پارچە هۆنراوەیـــەکی دەخەمە بەردەستی خوێندەوارانی گەلی کوردمـــان هیوامان سودبەخشیەتی .

# میرزا ئەڵماس خان

— ١ —

**قیبلەم خەمینم**

**قیبـــلەم خەمینم ، قیبـــلەم خەمینم**
**قیبلەم هەمیشـــــە پەی تۆ خەمینم**
**پەی تۆ ئەراڵێـــل ڕوی ســـەر زەمینم**
**پەی تۆ نەمـەنـەن ڕەنگ نـەچەمینم**
**پەی تۆ لیلاویـم ئـامـان وەچەمـدا**

پەی تۆ یۆم مەیەن وەیانەی خەمدا
پەی تۆ مگێلووم بێدی وەبێدی
پەی تۆ مگێلووم وەنا ئومێدی
پەی تۆ شوم تالەم سیا ستارەم
پەی تۆ هیجران بار چە زێد ئاوارەم
پەی تۆ ڕەنجەڕۆ ڕەنج وەعەبەس بیم
پەی تۆ سیابەخت بێ‌بەواو بەس بیم

طوفەیل غەمناك شار تارانم
گیرۆدەی زەنجیر شاهـ ئێرانم
بێکەس‌و بێوەر بێ‌یارو یاوەر
غەریب بێ‌کەیف چە ئێل دەربەدەر
چە صوب تا بەشآم گرینەن خدێم
ئاوات مەوازم من وەمەرگ وێم
پەشێوو ماتم دەرونم زارەن



● هەردەویل کاکەیی ●

ئەلماس هەرپەی تۆ دەرونش هونەن
ساقیبلەم شەرتەن بزانین چونەن

— ٢ —

یاران دوستاخم ، یاران دوستاخم
چە شار تاران منیش دوستاخم
هامراز مەینەت شەریك ئاخم
بەرکم فەلاخەن پەی یاران داخم

مەحبوس مەئیوس بەرگم دەوارەن
پەی دوری ولآت خاتر خەمینم
خوڕاو بەرمەشۆ سەیل ئەسرینم
غەریب نەگۆشەی کونج شارآنم
ئینتیزار وەدین دیدەی یارانم
سنە نشینان بنیشان وەنەاد
غەریب تاران بکەران وەیاد
هەرکەسێ واچۆ کە تاران خاسەن

ڕاست ماچۆ ئەمما ئەڵماس کەساسەن
مەر هــــەر خوداوەند کارساز کاران
ئێمەیش بـەرکـەرۆ چـە شـار تاران
منو دەماوەنـد شــەرتێکمان کەردەن
ئەو تەم بۆ من غەم تاوەڕۆی مـەردەن
یاران هامســـەران قەومانو خوێشان
هەرگیز چـەو بۆنـە جەورم نەکێشان
ئینـە گێشـــت کەردەی کار گەردونەن
کەس نمەزانـۆ حــاڵ مـن چـونـەن
یـە ئەڵماس واتـەن چە تاران دوستاخ
پەی دوری یاران هەرمەکێشـــۆ ئـاخ

فامو ناموســـت مەشـــۆ وەزایە
ئاهوی مشـــك تەتار قەیتـەر تەتاری
چۆن مەبـۆ وەجفت شـــێر شکاری
چەنی ناشی تەخت مـەکـــەن شەریکی
ئاخـر مـاوەرۆ مـایـەی خـەریـکی



— ٣ —

هۆراوەیەکی هۆنیوەتەوە بەناونیشـــــانی « پەند نەسیحەت مەلاّ ئەڵماس خان » بریتیە لـە (٦٨) دێڕ وا چەند بەیتێکی لێرەدا دەنوسینەوە ..

پەوسەش نواختەن گەردانای گەردون
نیمایەی فەساد بێشــــەرتو بێشون
تەر زانیو حوکـم لوقمانت بـــەردەن
ئەر چون ســولەیمان بەساطت گردەن
ئەر دەستت بەدەست ئەخی سپەردەن
عاقیبەت مەرگەن هــەر مەبۆ مەردەن
خەلاســیت نیەن چـە مەرگو پیری
ئاخـــرت مـــەرگـەن مەبـۆ بـوێـری
یـاران یـاوەران وەبـەخت وێتـــان
پەندێ پەی پەرداخ بواچۆن پەیتـــان
پەی واتەی ســـالان بگێرۆن نەگۆش
حەرف واتـەی من مەکـەن فەرامۆش
تـا چە دومـای من گـــەردم بـەرۆباد
بونـان وەچـەم من بکـــەن وەیـــاد
چە نەصــــل ناپاك نەمەندەن ئومیـد
ســـیا وەشـوستەن نمە بـۆ سـفید
چە زشـــت زاڵم مەنیشـــە غـافـڵ
فەزاش نەقەســـتەن چون ژار قاتـڵ
چون مەبۆ کـەرۆن سـەودا وەخائین
قولنـگ قـازان شـــەریك شـاهین
چەنێ زنـاکـــار مەبن هامســـایە

دوشـــمن زەلیـل مەشـــمارە صـــەغیر
مەردت بناســــــــه وەتەدبیر پیر
وەنا ئـەس مـەکــــەر ڕاز نیهــــانی
چە واتـــەی واتـــەت خەجـل مەعـــانی



حەرف ناپوختە بـەر نەشـــۆت نەدەم
مەحالـەن موشـــکل هەنی بیـۆجـەم
سوخەن نەگویرەی دەرون بکەر ســەرد
قەرار دەر نـەدڵ وینـەی نەقش‌بەرد
وەخەیاڵی دڵ بســــــــەنجە نەجاش
ئەوســا نەزوبـان دەهەن بکەر فـاش
ناکەس نائەســـــەن چە نەصل ناپـاك
خشـــت خەیاڵش هانـه خەتـەر نـاك
ئـەر بەچـه گـورگێ بگیـــــری نەوەر
پەر وەردەش کـەری وەشیرو شەکەر
وەربۆ وەئـاهـوی تـەتـاران هـەوەر
چە سنوور دەور جەمشـــید دەودەر
ئـەر بۆ وە بولبول باغـو هـەیـوانی
بگێبـڵو نـەدەور ســــــنورو کـانی
عاقیبـەت گورگەن هەوای بەد پێشەن
دایم نە پاریز بەرخ چەنی مێشــــەن
ئـەر بـه چە شـــاهین بگیری وەبـاز
پـه لوقمەی طەعـام بدەریش دڵـواز
عاقیبـەت شــــــاهین نەئێش جەنگەن
دایم هـەر نەکوشـــت قەصد قولنگەن
ئـەر گورِی خـەرێ بگیـری چـه بەند
ئاخورِش ئاجور ئەبریشـــــــم کەمەند
کراس چە ئەطلەس بپوشـەش نەوەر
خزمەتکارش بۆ چەنـد مەرد مۆهتـەر
وەسەدای سەڕان خەریش هەر خەرەن
عاقیبەت نەشــــــۆن تەرس ماخەرەن
یە پەند پـڕ حەرفێ واتـەی ئەلماسەن
ئەر سەد خەراب بۆ هەر خاسی خاسەن

— ٤ —

هەتـاتـە ماگێ شــــــادی ڕابوێرە
خـەفــــەتی دەرون لــــەدڵ دەربێنـــە
لەبەر هەوشــــــارو مێرگو چیمەن
بنۆشـــــــه بـادە ئازاتـــــه دێـره
هەتـا ئـەتوانی بـــژی بـەخۆشــــی
ژینت مـەخــەرە نـاوی پەرۆشـــــی
ئەگــــەر گـەرەکتـه نەمێنێ ئـەنۆت
ئەبێ شــەرابی گـوڵگون بنۆشـــــی

# دوو غەزەلی بڵاونەکراوەی عورفی

● ئومێد کاکە ڕەش ●

لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٤٦٦ ڕۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ لێکۆڵینەوەیەکی کورتم لەسەر مامۆستا ( عارف / عورفی ) شاعیری پایە بەرزو ناوداری کورد بڵاوکردەوە کە تا ئێستا زۆرکەم لە هەڵبەستەکانی کەوتۆتە بەر چاومان ... بەتەنها بەیتە بڵاوکراوەکەی نەبێت ....

**جەژنی قوربانە بە قوربان نۆبەتی قوربانیـە**
**بۆ تۆ قوربانی بە قوربان گیانی من قوربانیە**

کە هەمیشە وێردی سەر زمانی ئەدەب دۆستانەو لەکاتی جەژنی قورباندا دێتە وەیادمان ... ئەم تاکە هۆنراوەیە زیاتر شاعیری پێناساندوین و تا ڕادەیەك لێهاتووی و توانای ( عورفی ) بۆ دەرخستوین . ئەو باسە کورتەی ( هاوکاری )یش تا ڕادەیەك تیشکی خستە سەر چەند لایەنێکی هونراوەکانی ... بەڵام ئەوەندە نەبوو کە خوێنەر لە تام و چێژی شیعرەکانی تەواو ئاشنا بێت و ئارەزووی ئەدەبی بشکێنێت ، بەتایبەتی بۆ شاعیرێکی وەکو ( عورفی )ش کە خاوەنی دیوانێکی گەورەی شیعرەو جۆرەها غەزەل و شیعرو هۆنراوەی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و دلداری تێدایە کە هەموو بەیتێکی هەست ئەبزوێنی و جۆرە مۆسیقایەکی دەروونی ئەبەخشێت . کە بە باسێکی واو چەندەها باسی تریش ناتوانین ئەو مەبەستە بهێنینە دی کە ئەمانەوێت ..

لەبەر ئەوەی دیوانەکەی ( عورفی )م لەبەر دەستایەو خەریکی نووسینەوەی شیعرەکانیم بەونیازە کە لە دەرفەتێکدا ئامادەی بکەم بۆ چاپ و کەلینێکی کتێبخانەی کوردی پێبگرینەوە .. تا بەو مەرامە جاربەجار سەرنجی خوێنەری ئازیز ڕائەکێشم بۆ گوڵزارە ڕەنگینەکەی شاعیرو گەشتێکی پێدا ئەکەین .

وا لەم دەرفەتەدا دوو غەزەلی بڵاو نەکراوەی ئەخەمە بەرچاو بۆ چونە ناو خەیاڵات و سۆزو ئەندێشەی ئەم شاعیرە مەزنەوە .

**خۆزگە ئەمزانی دڵی من بۆچی وا حەیرانتە**
**هەروەکو پەروانە دەوری شەمعی ڕووی جانانتە**
**دڵ بەدڵ بۆ ڕابەرت ئیختیاری پێ نەما**
**دائیما فەرمان بەری فەرمان بەری فەرمانتە**
**فکرت وابوو بۆ ڕەقیبت دەس لەئێمە هەڵگری**



ئەی دەخیلت بم ئەکەی دەستی منو دامانتە
مەزرەعەی غەم دەروی بێ ئاوی ئەکێشی بۆخوا
دەستو بردێ چاوەڕوانی قەترەیە بارانتە
دوای ئەوەی سینەم ، برینی کۆنی سەری هەڵدایەوە
تێگەیشتم زەخمی نوکی تیرەکەی موژگانتە
هاژەی فرمێسکی چاوم بەکرەجۆی گرتەبەر
غەیر لە دووری تۆیە بۆیە وا بەکوڵ گریانتە
چەژنی قوربانە بەقوربان نۆبەتی قوربانیە
بۆ تو قوربانی بەقوربان گیانی من قوربانتە
تۆلە کۆیی ڕیزی سوارانی ئەو جەوانانت لەکوێ
تازە بەم عومرە نیازی عەزمەیی زربانتە
دڵ لە دوریت شەو ئەسوتێ وەك فەنەر تاكو سەحەر
غەیر لە هیجرت شەو چراغی مەجلسی دیوانتە
تافی جوانی چوو ئەما کەوتوتە حاڵی غەرغەرە
وا ئەزانم ئینتظاری قەبرەکەی سەیوانتە
گردی سەیوان حورمەتی میوانەکانت ڕاگرە
پەنچو دوو ڕۆژێکی‌تر وا عارفیش میوانتە

* * *

صەبا هەستە درەنگە نامەیەك لەم پیری غەمبارە
برۆ تەقدیم بکە بۆ خزمەتی ئەو شۆخی نازدارە
دەخیلت بم صەبا عەرضی‌بکە ئەوضاعی ئەم پیرە
لەباتی عومری چی‌ماوە رەلیلو زارو بێزارە
فێراق کارێکی کرد یارا شەو ڕۆژی لە گریانا
بەلێشاو دێتە خوار ئەسرین لە چاوی عەینی ئاوبارە
تکا بەد عەهدیو سستی بەسە لەم ئاخری عومرە
دەس هەڵناگرم هەتا ماوم ئەگەر بمدەن لە سێدارە
لە جێی لوطفو خۆشی ، شاید دەستی کێشایە
ناوجەرگم
بە فریامان کەون ئەمجا دەخیلە خەلقە هاوارە
جەفای بۆ ئیمەیە مەیلی صەفای بۆ خاطری غەیرە
تەماشاکەن موسوڵمانان چ موسوڵمانێکی غەدارە
ئەما طاقەت بە ئیمدادم بکەن یارانی کەم فرصەت
لە ڕێی خوادا موسوڵمانینە ئەم دەردەم بکەن چارە
عەبەث‌عومرم بە ضایع چوو لەڕێی لەیلێکی بێ‌رەحما
نەتیجەی هەروەکو مەجنون جێگام صەحراو تۆسارە
لەشینی شوخی شیرینا کە دەرچوو گیانی شیرینم
ڕەقیبی بەدخو وەك خەسروی پەرویز چەدەربارە
ڕجاو نامەو دەخالەت هەرسێ تەئثیری نەبوو
( عورفی )
عیلاجی ناکری ئەم ظالمە لەم کارە ئینکارە
بنێژن لاشەکەم ئەمجا لەکێویی پستونی بێکەس
هەتا قیامەت حیکایەت لایقی تەسجیلو گوفارە

❋ بەشی دوایی ❋

تۆمارێکی تایبەتی دەربارەی :

# کــــۆڕی شــــیعری نوێی کوردی

ئامادەکردنی : **صلاح شوان**

## پێشەکی:

بەم بەشەی کۆڕەکەمان کـە تایبەتە بە پرسـیاری شەشەم کۆتایی گفتوگۆکان دێت ، چونکە پرسـیاری حەوتەم لـەگەڵ پرسـیارەکانی تـردا وەڵام درایـەوەو پێویستی بە دووبارە کردنـەوەی ئـەو راو بۆچوونانـە نەدەکرد ، بۆیە پشتگوێخرا ·

بە کۆتایی هاتنی بڵاوکردنەوەی بیروراو گفتوگۆی شاعیرانو ئەدیبانی بەشدار لـەم کۆڕەدا ، هیواداریـن سودێکی بـە ئەدیبانو بـە خوێنـەرانیش بـە گشتی گـەیاندووبێتو ، خزمـەتێکی دڵسۆزانـەی رەوتـە پڕشانازییە کەی ئەدەبەکەمانی کردووبێت ·

هەڵسـووڕێنەری ئەم دانیشـتنەی کۆڕەکـە پرسـیاری شـەشەمی بەمجۆرە خسـتەروو ..

● **صلاح شـــوان :**

**رەخنەی ئەدەبی دەربارەی شـــیعری نوێی کوردی چەند خزمەتی شـیعرو شـــاعیران لە لایەکو ، خوێنەر لە لایەکی ترەوە دەکاتو کردووە ؟**

واتە دەوری رەخنەی ئەدەبی ئەمرۆمان لـە خزمەتکردنو پێشخستنی شــــیعری نوێو

شاعیرەکانماندا چیبووەو ، چەند خزمەتی خوێنەریش کردووە بۆ تێگەیشتن‌و چێژ وەرگرتن لە شیعری نوێ‌و شارەزاکردنی لە چاکەو خراپەی ئەم شیعرانە ؟

● **جمال شاربازێری :**

ڕەخنەی ئەدەبی بە گشتی تا سەرەتای حەفتاکان هەر لە خزمەتی ئەدەبەکەمان‌و بۆ پێشخستنی شیعری چاک‌و شاعیرە بە تواناکان‌بووە ، بەڵام لە حەفتا بە دواوە لەبەر هەندێ هۆی دوور لە ئەدەب مەسەلەکە بووە بە ڕەخنەبازی‌و بە کۆمەڵ‌و تاقم‌و دەستەکاری‌و ، بە شێوەیەکی خراپ بەکارهێنراوە ، کە ئەدەبوو وابێت‌و نابێ ڕێگای ئەمجۆرە شتانە بدرێت لە ناو ئەدەب‌و ئەدیبانماندا بڵاوبێتەوە ، بەڵکو پێویستە بە گشت لایەک هەوڵی بنبڕکردنی بدرێت .

● **کریم شارەزا :**

ڕەخنە دەربارەی شیعر لە لای ئێمە زیاتر هەر لایەنی لێکدانەوەی شیعری گرتووەو ، ڕەخنەی وامان نییە لە شیعر قووڵ‌بێتەوەو گشت لایەنەکانی بگرێتەوەو بتوانین ناوی ڕەخنەی مەوزووعیی لێنێین کە هەلومەرجی تایبەتیی خۆی هەیە . تەنانەت لەمەشدا ڕەخنە دەربارەی شیعری نوێ شتێکی وای نەکردووە ، ئەگەر نەڵێین زۆریشی بە هەڵەدا چووە لەو لێکدانەوانەدا ، دیارە ئەمەیش کەموکووڕییەکی گەورەیە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا دەربارەی شیعر ، ئەمە وەکو جۆر ، وەکو چەندییش ڕەخنەکانمان بەشێکی زۆر کەمی شیعری نوێ نەبێت هەر خۆی لێنەداوە .

● **صلاح شوان :**

لەو دوو ڕایەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕەخنە دەربارەی شیعری نوێ داهێنەرانە نەبووەو لە مەوزووعییەت دوور کەوتۆتەوەو تووشی تاقم تاقمێ‌بووەو ، زیاتر ڕەخنەی لێکدانەوانەبووە ، کە گشت ئەمانەش سەلبین‌و خزمەتی ئەدەب‌و میللەتەکەمان ناکات .

● **حسیب قەرەداغی :**

هەر هونەرێك لە لای ئێمە خوا بیەوێ بەدبەختی‌بکا تووشی ڕەخنەی ئەکا ، چونکە ڕەخنە لای ئێمە یان بۆ پێداهەڵدانی خۆڕایی‌و بەرزکردنەوەی ناهەقانەیە ، یانیش بۆ دارکاریکردنی بەرهەمی ئەدەبی‌و ئەدیبەکەشە .

ئەو زانیارییەی کە ئیستا لە دنیای دەرەوەدا ناوی نراوە ڕەخنە لە لای ئێمە نییەو ڕەخنەگرەکان هەوڵی ئەوەیان نەداوە ئەوەندە لەو بەرهەمە قووڵبینەوە تا بە تەواوی تێی‌بگەن . ئەمەیش لەبەر ئەوەی تەمەنی ڕەخنە لای ئێمە زۆر کورتە لەچاو خەڵکی‌ترەوە .

بەڵام هەندێ لە شاعیرەکانمان ـ بۆ نموونە « شێرکۆ بێکەس » ـ جاروبار ڕەخنەی وایان بڵاوکردۆتەوە کە نرخێکی گەورەی هەبووە . ڕەخنە پێویستە چرابێت ، نەك تێلا .

● **کمال غەمبار :**

ساوایی ڕەخنەی ئەدەبی لەناو ئێمەدا هۆی سەرەکیی گشت کەموکووڕییەکانی ڕەخنەیە ، چ لە چاو ڕەخنەی عەرەبییەوە کە لە سەردەمی جاهیلییەوە هەبووەو چ لە چاو ڕەخنەی کوردی جا ئەگەر ڕادەی پێشکەوتنی ڕەخنەی کوردی لەگەڵ تەمەنیدا بەراورد بکەین بە دواکەوتووی لە قەڵەم نادەین .

ڕاستە ڕەخنەی کوردی بە گشتی لێکدانەوەیی بووەو هەر لە سەر بناغەکەی مامۆستا علاء الدین سجادی‌و ئەوان ڕۆیشتووە ، بەڵام ڕەخنەی تەفسیریش لە داهێنان خاڵی نییە .

جا ئێمە هەر چەندە گلەیشمان لە ڕەخنەی شیعری کوردی هەبێ ناتوانین بڵێین دواکەوتووە .

● **شێرکۆ بێکەس :**

ئەوەی ئاشکرایە ڕەخنە پێ بە پێی داهێنان

دێت‌و لەگەڵ گەشەکردنیدا گەشە ئەکاو پێش‌ئەکەوێ ، بەڵام ئەمە لای ئێمە ، بە تایبەتیش لە رەخنەی ئەمڕۆماندا رێك بە پێچەوانەوەیە ! رەخنەگرەکان زۆر جار ئەو راستییە بە گوێماندا ئەدەنەوە ، کە گوایە شیعری پێشکەوتوومان نییە بۆیە رەخنە پێش‌ناکەوێ ، ئەی نازانم رەخنەگرەکانی ئەمڕۆمان دەربارەی شیعری پێشکەوتووی « گۆران » چییان بە چی کردووەو کام داهێنانی ئەو شاعیرەیان خستۆتە بەرچاو خوێنەران ؟ کەوابوو مەسەلەکە ئەوە نییە شیعری چاکمان نەبێ ، بەڵکو ئەوەیە رەخنەگرەکانمان تووشی گیروگرفتی هوشیاری‌و نەبوونی رۆشنبیرییەکی فراوان‌و بیروباوەڕێکی راست‌و زیندووە بوون . ئەوەی لای ئێمە هەیە تەنها چەند هەوڵێکی کەمی رەخنەیە ، ئەگینا رەخنە وەك رێبازو وەك کارێکی گشت لایی تەواو دروست‌نەبووە .

رەخنە گرەکانمان کۆمەڵێك راو وتەو کێشانەو پێوانەی ئامادەیان بە دەستەوەیەو بەسەر گشت بەرهەمێکدا ئەیسەپێنن ، جا ئەو کلیشانە چەند بە بەر ئەو بەرهەمە ئەکا یان نا ، ئەوە لایان گرنگ نییە ، رەخنە پێویستی لە گیانی بەرهەمەکەوە هەڵقوڵابێت ، نەك لە دەرەوە بەسەر بەرهەمەکەدا بسەپێنرێت ، من لە شیعری ئەمڕۆی کوردیدا کۆمەڵێك لایەنی هونەریی نوێ ئەبینم نەمدیوە تا ئیستا رەخنەگرەکان پێیان زانیبێت ، چونکە نە ئەو سەرنجە قووڵ‌و سارەزایانەیان هەیە نە ئەشتوانن لە قاوغە وشکەکانیان دەربچن .

هەندێك لە رەخنەگرەکان فیکرو بیروڕای تایبەتی‌و تا ئەتوانم بڵێم شەخسیی خۆیان کردووە بە پۆلیس بەسەر جیهانی ئەدەبەکەمانەوەو ، بە گشت جۆرێك ئەیچەوسێننەوە ، رەخنەکانیان لە تێلاکاری‌و شەڕە چەقۆ ئەچێت‌و فری بەسەر ئەدەبەوە نییە ، چونکە نە فیکرو نە خوێندەواری بە پێ چێژی ئەدەبی‌و بە بێ شارەزایی هونەری رەخنەگر دروست‌ناکەن ، هەر بۆیەش رەخنەیەکی تەواو و مەوزووعی لای ئێمە تا ئیستا نییەو ، هەندێ هەوڵی زیرەکانەو چاك هەیە لە سنووری وتار دەرنەچووەو ، بە چەندین هەنگاو لە دوای شیعرەوەیە .

● **ع . ح . ب :**

وەك کاك « شیرکۆ » وتی رەخنە پێویستە رێ‌پیشاندەربێت‌و .. بۆ بنیات‌نانی ئەدەبێکی گەشاوەترو پێشکەوتووتر بێت ، نەك بۆ سەرو گوێلاك شکاندن‌و قسەی ناهەموار بە یەکتری وتن‌و یەکتری شکاندنەوە ، رەخنەگریش پێویستە خۆی تەرخان کردبێ بۆ کارەکەی .. جا نازانم حاڵی رەخنەی لای ئێمە بۆ وایەو ، بۆ تا دێتیش خراپتر ئەبێ ؟! .

● **صلاح شوان :**

بە پێی بیروڕای مامۆستایان وا دەرکەوت رەخنە دەربارەی شیعر لە لای ئێمە نەك هەر خزمەتی شیعرو شاعیران‌و خوێنەرانی نەکردووە، بەڵکو زیانیشی پێگەیاندووە بە گشتی‌و ، ئەو هەوڵە چاکانەی هەن کەمن‌و زیاتر هی شاعیران خۆیانن .

● **عبدالرزاق بیمار :**

بە رای من ئێمە رەخنەمان هەیە ، بەڵام لە سەرەتادایەو رەخنەگرانمان پێویستیان بە زیاتر خۆماندووکردن هەیە ، راستە رەخنەگرەکانی ئێمە ئەکادیمی نین‌و پسپۆر نین ، بەڵام ئەوەندەی پێیان کرابێت کەمتەرخەمییان نەکردووە ، چونکە رەخنەگری تەواو زۆر مەرج پێداویستیی ئەوێت‌و هەر کەسەی چەند لاپەڕەیەکی رەش‌کردەوە نابێ بە رەخنەگر ، هیچ شتێك نییە هەر یەکسەر بە تەواوی بێتەکایەوە ، ئەمانەی باسکران هەموو هەنگاون بۆ شتی باشترو چوونە پێشەوە .

● **محمد امین پێنجوێنی :**

رەخنە لە بنەڕەتدا پێویستە کارێکی دروست‌کەرانەبێت‌و ، بە مەبەستی نەهێشتنی کەموکوڕییەکانی بەرهەمێك بنووسرێت ، بەڵام لە لای ئێمە بە جۆرێکی‌تر کەوتووەتەوە ، یان بۆ پێداهەڵدانی بە خۆڕاییە لە بەر پەیوەندیی چاکی نێوان رەخنەگرەکەو خاوەن بەرهەمەکە ، یانیش بۆ شکاندنەوەیەتی ئەگەر ناریك‌بن‌و حەز یەکتری

نەکەن ، واتە رەخنەکە بۆ کەسی نووسەرەکەیە ، نەك بەرهەمەکەی ، راستەکەشی پێویستە بە پێچەوانەوە پەیوەندیی بە خاوەنەکەیەوە نەبێت‌و دەربارەی بەرهەم بێ . هەر لەسەر ئەم بناغەیە چەوتەش بەرهەمی لە لایەن رەخنەگرانەوە بە چاك لە قەڵەم ئەدرێت‌و هی چاکیش بە خراپ ، مەگەر بە دەگمەن وا نەبێ . رەخنەی زانستی‌و مەوزووعی حەقی بەرهەمەکەی خۆی دەداتێ بە چاك‌و بە خراپ بەبێ ئەوەی خاوەنی بەرهەمەکە هیچ کارێکی لەم رووەوە لێبکات . بۆیە رەخنە لە لای ئێمە وەك کاك « شێرکۆ » وتی بووە بە مەسەلەیەکی خێلەکی‌و کۆمەڵ کۆمەڵ‌کاری .

● **کاکەی فەلاح :**

بەو پێیەی کە رەخنە سێبەری درەختی ئەدەبە ، ئەگەر بڵێین رەخنە لە لای ئێمە ساوایە ، ئەمە وا ئەگەیەنێ ئەدەبەکەشمان ساوابێ ، کەچی راستییەکەی وا نییەو ، ئەدەبەکەمان قووڵ رەگوریشەی لە ژیانی رۆشنبیریماندا داکوتاوەو ، ئەدەبێکی تەواو پوخت‌و پێشکەوتووشمان هەیە ،

بەڵام رەخنەمان دواکەوتووە ، بۆ وەڵامی پرسیارەکەش من رام وایە رەخنەی ئەدەبی دەربارەی شیعر هیچ خزمەتێکی ئەوتۆی نەکردووە . رەخنە لە لای ئێمە بە رادەیەکی زۆر پشت بە سۆزو هەڵویستی نووسەرەکەی دەبەستێ ، چ رق‌و چ خۆشەویستی کەسان کار دەکاتە سەر نووسینەکانیان‌و لە مەوزووعیەت دووری دەخاتەوە ، ئەمە جگە لە جیاوازی رێبازە ئەدەبییەکان‌و هەڵویستە فیکرییەکانی هەر کەسێك لەمانە کە وایان لێدەکات چاو لە ئاستی راستییەکە بنووقێنن‌و بەوجۆرەی لێك‌بدەنەوە کە خۆیان ئەیانەوێ ، نەك بەو جۆرەی کە هەیە .

رەخنە پێویستی بە شارەزایی مێژووی ئەدەبەکەو رێبازە رەخنەییەکانی جیهانی هەیە ، بەڵام زۆر لە رەخنەوانەکانی ئێمە ئەو شارەزاییەیان نییەو ئاگاداری مێژووی ئەدەبی کوردی نین ، بۆیە ئەوەی لە بێگانەی وەرئەگرن بە باڵای ئێمەی ئەبڕن ، ئەنجامەکەش ئەمەیە کە ئەیبینن . رەخنە ئەبێ بچێتە ناخی بەرهەم‌و نووسەرەکەوەو ئەگەر کەموکووریەکی لیا بینی چارەسەری بکات ، رووکردنە شتە خراپەکانیش لە رەخنەدا خزمەتی نە ئەدەب‌و ئەدیبانیشمان ناکات ؛ بۆیە پێویستە رەخنەگرانمان لایەنە گەشەکانی ئەدەبەکەمان پیشانبدەن نەك لایەنە تاریك‌و خراپەکان .

● **دلشاد محمد امین :**

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە لەم کۆڕەماندا لەسەر هیچ شتێك ئەوەندەی ئەم مەسەلەیە رێك‌نەبووین ، ئەو رایانەی برادەران هەیان‌بوو منیش هەر ئەو سەرنجانەم هەیەو وای ئەبینم رەخنەگرو رەخنەنووسەکانمان ئەیانەوێ لە رێگای یەخەگرتنی ئەدیبان‌و تانەو توانج تێگرتنیانەوە دەرکەون‌و ئەو نووسەرانە بکەن بە پێپیلکانە بۆ خۆیان جا چ بە سەرکوێر کردنەوەو داپلۆسین بێت ، یان بە مەدح‌و ستایشی خۆڕایی .

رەخنەگران رەخنەکانیان لەم لاو ئەو لاوە کۆدەکەنەوەو ئامادەن بۆ ئەوەی بەسەر بەرهەمێکدا بیخەن ، وەکو کڵاو گرتوویانن بە دەستەوەو بە دوای ئەدیبێکدا ئەگەڕێن بیکەنە سەری کە لە زۆربەی جاریشدا بەو بەرهەمەو بەسەر ئەو ئەدیبە ناکات‌و هەر بە زۆر بەسەریدا سەپێنراوە ، جا ئەگەر رەخنەکە ملشکاندن بێت ئەوە ناحەزیکی بۆ ئەدۆزنەوەو ، خۆ ئەگەر پێداهەڵدانیش بێت ئەوە دۆستێك . هەردوو لایەنەکەش زیانبەخشن نەك سوودبەخش .

● **صلاح شوان :**

ئەم بارەی برادەران باسیان کرد لە رەخنەی ئەدەبیدا لە لای ئێمە دیاردەیەکی ناهەموارەو پێویستی بە چارەسەر هەیەو ، دڵنیاشین ئەوەی خۆی بە دڵسۆزی ئەدەب‌و میللەتەکەی بزانێت‌و بیەوێ خزمەتی بکات پەنا ناباتە بەر ئەم شێوە خراپانە .. هیوادارین بە گشت لایەکمان بتوانین خۆمان لەو ناتەواویانە لابەین بۆ ئەوەی ئەدەبەکەمان گەشاوەترو خزمەتگوزارتربێت بۆ میللەتەکەمان‌و .. بە کۆتایی هاتنی ئەم پرسیارەش کۆتایی بە کۆرەکەمان دێت‌و سوپاسی گشت لایەکتان دەکەین‌و بە هیوای کۆڕو یەکتربینینەوەی سەرکەوتووی تریش .

# بەرهەمی

لاوانی قەڵەم بەدەستی کورد :

لەم ژمارە بەدواوە .. ئەم گۆشە والایە لەبەردەم بەرهەمی بەپێزی ئێوەدا ئەکەینەوە ، تادەنگی جیاجیای ئەم وەچە ژانگرتووەی کورد ، لەنێوی‌دا رەنگ بڕێژێت .. ئەخوازەللا ، لەم رۆژگارانەدا وا خەریکە پەیتا پەیتاو بەپێی ( یاسای پەرەسەندنی ژیان ) جۆرە بەرهەمێکی تازەی نێو کۆڕی لاوان گوڵ ئەکاتو موژدەی پێ‌یەو بوونو بەرامە .. موژدەو بەرامەی وشەی گەوارای کوردی .. بەدەنگەوە هاتنی دەنگی ئێوەش لەئەستۆی هەموو لایەکدایەو هەموو لایەک بەرپرسیارن ...

# لاوان

● محمود زامدار ●

ئێمە لێرە ، لە ( بەیان خان )و لەم گۆشەیەدا ، ئەم ئەرکە ئەخەینە سەرشان - ئەرکی بایەخدان بەبەرهەمی هەمە چەشنە لاوان - و بەلێپرسینەوەیەکی مێژوویی ئەزانین و ئەوەی پێمان بکرێ و بۆمان بلوێ و سەربگرێ دریغی لێ ناکەین .. گوێچکەی دڵمانی بۆ ئەگەینەوە .. بەتایبەتی کە گۆڤارێکی تایبەتی وایشمان نیە ، تا بەتەواوی خۆی بۆ ئەم بەرهەم و ئەرک و بابەتە تەرخان کردبێت .. بەڵام ( بەیان )ی گۆڤار .. هەروەك چۆن لەم تەمەنە درێژەیدا بووە بە ( قوتابخانە )یەکی فراوان و سەدان دەنگی زوڵاڵی کوردی ، خۆی تێدا دۆزیوەتەوە.. ئاواو بەو چەشنەش ، باوەش بۆ کشت بەرهەمێکی لەبارو شیاوی لاوان ئەکاتەوەو توند توند بەسنگیەوەی ئەگوشێت .. کەسیش نیە حەزنەکا لەسەر سینەی گەرمی ( بەیان )دا ، سەرخەوێ نەشکێنێ .. !

ئەمە سەبارەت بەئێمەو بەکارو ئەرکی ئێمە .. سەبارەت بە ( ئێوە )ش ، ئەوا هەروەك چۆن ئەم گۆشەیە بۆ ( ئێوەیە )و بەبێ ( ئێوە )ش هەڵناکاتو لەکار ئەکەوێت ..

بۆیە نیازی بەردەوامان ئەوەیە کە : هەریەك لە ( ئێوە ) لە ئاستی لێپرسینەوەی خۆیدا بێت و بیبێنە دەستەبەری بۆ بەردەوامبوونی ئەم گۆشەیەو قەڵەمی رەنگین و سیحراوی خۆی بۆ بخاتە کار .. جا چ بە چیرۆك بێت ، یا دراما ، یا رەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و فیکری .. یا شیکردنەوەو ئەدەبی بەراوردکار .. یا دەق و مێژووی ئەدەب و کەلەپووری زیندووی ئەدەبی نەتەوایەتیمان .. یا هەرشتێ کە پێوەندی گیانی بەگیانیانەی بە ئەدەبی کوردییەوە هەبێت .. یا پەخشانە شیعری هاوچەرخ .. ئینجا ( شیعری جوان ) گەر ترا .. ببڕای ببڕیش شیعرۆکەو میعرۆکە جێگەو مێگەی لەم بوارە دانابێنەوە .. ! لەهەمان کاتیشا ئەبێ شاکارەکانی ئەدەبی جیهانی فەرامۆش نەکرێت ... !

بەڵام ئەوەی کە ئەبێ و پێویستە زۆر زۆر لەبەرچاو رابگیرێت و بایەخی تەواوی پێ بدرێت ، مەسەلەی ( زمان )ە .. ئەبێ ( زمان )ی بەرهەمەکە ، زمانێکی رەسەن و سوارپاك و بێگەردبێت و سەر بە مێژووی نەتەوەو بە ژیانی رۆژانەی کۆمەلانی خەلك و هەروا بواربڕیش بێت و روو لە پاشەڕۆژ بکات .. !

چاوەنۆڕی بەرهەمی بەپێزی دەست و قەلەمی رەنگینتانین ، ئێوە ئەی لاوانی کورد ، ئەی چراوگ هەڵگرانی پاشەڕۆژی ووشەی شیرینی کوردی .. !!

# زەماوەندی کچە بێری و کوڕە شوان

• شیعر : تاریق هەلکەوت

زەماوەندی کچە بێری مێخەك لەمل ، بەکێ دەبڕێ ؟

**بەکوڕە کوێخا یان کوڕە شوان .. !؟**

خۆ کچە بێری دلداری خۆی چاك دەناسێ‌و

**چاك دەزانێ ، عەشقی دلی لە ئامێزی کوڕە شوانا نەبێ هەرگیز ،**
**کەوی نابێ‌و هەر دەتۆرێ ،**

بەلام چەقۆی ڕقی سوری کوڕە کوێخـــا دانامرکێ‌و ،
هەر دەیەوێ خەوی شەوی ناو جێی گەرمی ..
بێنێتەدی .. !!

* * *

قامکی سڕ بووی ســــەر شمشالی ،
هەتاکوو دێ ، خەمی گینکڵ خواردووی ناخی ، لەنێو کەژی نزیکە دێ ،

**لەگەل لەرەی دەنگ‌و سۆزا ، پێدەژەنێ‌و**

**پێدەژەنێ .. !!**

* * *

**ئای کوڕە شوان ئۆقرە ناگرێ ،**

**هەر دێ‌و دەچی :**

تاوێ لەسەر کەپکە شاخێ ،
تاوێ لەقەدپاڵی بنارێ ،
دەمێ لەسەر جۆگە ئاوێ ، دەمێ لەســەر چەمێ ، ڕۆخی کانیاوێ ،

**چاوەڕوانی تیشکی خۆری ئێوارەیە ، پـەل بهـاوێ ،**



تاکوو مێگەل بداتــە پێش بەرەو ناو دێ ،

**چونکە شەیدای دوو چاوانی کچە بێرییە .. !!**

* *

گووتیان دوێنێ :

**کوێخـاکـەی دێ پـەنجـەی نوێژی ڕادەوەشان ،**

دەیگوت دەبێ زەماوەندێ لە ســــەرتاپای ئەم دێیەدا ،
هەر ساز بدرێ...
تاکوو مارەی کچە مســـکێن لە کوڕە گـەورەی ،
کوێخای حەوت دێ ، لە دیوەخانی میوانا ،
دەبێ ببرێ ..
چەندە دەڵێ بە نارەزووی دڵی خۆیشـی ، پیرەی پشـت کۆم ،
لە گەنجینەی حەڵاڵی خۆم ، !
لەبرێتیدا وادەیدەمێ .. !!

* * *

**کچی لەبەر هەتاو برژاو ، کچی بێناز**

کاتێ بیستی هەواڵی نوێ ،
ئەو کێی دەوێ‌و دەیدەنە کێ ،
هەر لەوێدا .. دوور لەترسان ،
نەك پەیمانێ هەزار پەیمان

**لەناو دڵ‌و سینەی خۆیا دەری هێنـاو ..**

**کردیـە دیـاری بـۆ کـوڕە شـوان .. !!**

# تریفەی مانگ

خەمەکانی « بیتهۆڤن »
بۆ « کۆنتیسە »ی ئامۆزای
● کەماڵ فرج توفیق ●

« کۆنتیسە » گیان
ئامۆزاکـەم
من ئەو زامەم
بە « بیتهۆڤن »
ناونراووم .. !؟
هەرچی جوانیو لەرەی ئاواز
کـە خولقێنرا
چەشنی چرا .. !
بەرەی هەستی مۆسیقاکەم
پێی نەخشێنرا .. ؟
هاڕەی تاڤگەی رووبارەکان
لێزمەی بارانەکەی پاییز
چاووی ماندووی .. !
« کۆنتیسە » گیان
« بیتهۆڤن »ی زەدەی عەشقت
هەرچی جوانیو لەرەی ئاواز
کە خولقێنرا .. !
لەم سرووشتە ئاڵۆزاوە
لە ناو نۆتەی مۆسیقاکەم .. ؟
دارێژراوە .. !
جریوەی مەل ... ڕەنگاو ڕەنگی تارای بەهار
سروەی پاکی ... دەمی گزنگ لە پاییزا
شنەی گەڵای ... کورپەی لانکەی تازەی ژیان
لەهاوینا ..
پێچە گلوی ... بەفری سپی لە زستانا
« سەمفۆنیا »ی خەم
لە ناو ناخی حەزەکانما
دەهەژێنن .. ؟
بەڵام گیـانـە
« کۆنتیسە »ی جوان



هیچ نابیســـــم
هیچ نابیســـــم .. ؟
تەنیا جوانی کە لە لام‌بێ
تەنیا ئەوەی کە ئەیبیسم
خەندەی لێوە زەردەکانت .. !
دەناسمەوە .. !
سیما پەشۆکاوەکەی تۆ
دەبینمەوە ...
« کۆنتیسە » گیان
نازدارەکەم
هەموو شەوێ
بەتەنیـــایی
کوێرەوەری ... لەلای نۆتەی
زامەکانم
چاو هەڵدێنێ .. ؟
« کۆنتیسە » گیان
تۆش دەزانی
بۆیەك نابیین .. ؟
تۆش دەزانی
کە هەردووکمان ... چەن تریکین .. ؟
ئای کەسەیرە ئەم تەمەنە
ئای کەسەختە ئا ئەم بوونە
ژیان لای من
بۆ یەك بوونە .. ؟
گیانە ... گیانە

من ئەو کەسەم
لەوەتەی هەم
تێشووی خەم‌و مەینەتیەکەم
هەگبەی ژین‌و بوون‌و تینم
دەلاوێنێ
دەلاوێنێ ... !

# چاوەڕوانی

● سمكۆ بهرۆز محمد ●

دوا رۆژبوو لەو رۆژانەی کە تاقی‌کردنەوە دەستی پێ‌کردبوو ئەمرۆ دەبێت هەموو شتێکی پێ‌بلێ‌و ئەوەی گیرۆدەی داوە سەری کلانەکەی لێ‌بزرکردووە دەبێت بەدوایدا بگەڕێت تا ئەوەی ختوکەی داوە ... دەبێت راستی‌و چەوتی‌یەکانی هەستێ ئەوەی بۆ دەرکەوێت تا لە دنیای خەیالآوی‌و خەونی ... رزگاری‌بێت . کارو داهات .. بازرگانی دەرەوە ، ناوخۆ .. هەلئاوسان .. بازاری بەشارەکی ئەورووپا .. سوود .. باربووکردن .. بەخشین ، ئەمانە هەموو گینگلیان دابوو تا بەیانی لەگەڵ ئابووری‌و ئابووری‌کاریدا تالبوو .

**دلی خۆی دایەوە :**

**ـــ « نا .. نا .. ترسی بۆ چی‌یە ، مرۆ دەبێت باوەری بەخۆی بێت ، ناپلیۆن بەگەورەیی خۆی دەترساو لە هۆلی تاقی‌کردنەوە هەستی بەدلە راوکێ دەکرد » .**

پرسیارەکانی خوێندەوە ... نەخشەیەکی روونکردنەوە بکێشە ، پەیوەندی نێوان دانە بەکارهێنەکان‌و دانە بەرهەم هێنەکان دیاری‌بکە .. جێ‌بەجێ‌کردنی بازاری بە شدارەکی .. خەرجی‌یە گشتی‌یەکان پێناسەبکە .. حیسابی رەوەن .. تەرازووی پێدان .. باجی راستەوخۆ .. دوەم .. سێ‌یەم ، هەموو لە بەرامبەریدا ئاشنابوو . دەستی پێ‌کرد چوارەم .. دووەم .. سێ‌یەم .. یەکەم .. پێنجەم .

گەرما گەورەترین شت بوو کە تەنگی پێ‌هەلچنیبوو ، خۆر وەك ئاشقێك لەپەنجەرەکەوە خۆی دەکوتایە ژووری پۆلەکەوە زیاتر تەندوری هەستیان دەکولآند تامکەکانی ئارەقەیان دەکرد نامەکەی لە دەست دەخزی .

**ـــ « کات هێشتا بۆ دەچارەکی دەوێت . وادیارە زووە نابابرۆم !؟ » .**

دە .. دەونیویەك لە دوای یەك دەرۆیی گەلێ شت چواردەوری مێشکیان تەنیبوو وایان لێ‌کردبوو خۆیان لە دنیایەکی سەیری دەدا .

**« تۆ وەك چیایەك بە هەردەم رووڵەباو رەشەبالێ‌و شانازی بەخۆیەوە دەکات » . ئەمانەی دەهاتەوە یاد کە بۆی نووسیبوو ... ؟**

هەمووجار دەیوتەوەو شانازی پێوە دەکرد. ماوەیەك بوو پرۆڤەی دەکرد ئەو پریڤانەی دەیویست پێبلێ هەموو رۆژێك وەك ئەکتەرێك رێکیدەخست‌و دیوتەزە .

— « ئەمە جوانــــە ، نا ئەمە ... ئەمە بەیفێکی نوێیە » .

لـــە قوتـــابخانەکـــە دوورکـــەوتنـــەوە ، بەرەو کۆلانەکە گلۆربوونەوە بێدەنگی نێوانیـــــــان ماوەیەك تەنگی پێ‌هەلچنیبوو . زیاتـــر ئارەزووی دەربرینی دەکرد چۆلی نێو کۆلانەکە زیاتـــر پـــالی پێوە دەنا تا داوە دەزوولەی دلی پەتالاکاتەوە .. تۆزێ بە خۆیدا هاتەوە سەرنجێکی دەوروبەری‌دا وەك توتی‌یەك تەنها گوێی بۆ گرتبوو کە راڤـــەی پرسیارەکانی دەکرد .

— « ت .. و .. ش .. ۆ .. س .. ی .. ، چەند ووشەیەکی درێژە لـە چوار پیتی دەنگدار پێنج پیتی بزوێن.ش..س.. م ..ت.. مرۆڤ بێزار قالە قورقوراگە دەریدەبری لەوێنەی ئافرەتێکی ... دێتە بەرچاو » .

ئەو ووشـــــــانە بوو کە لەدلی‌دا دەربری ماوەیەك بێ‌دەنگ بوو .

بە دووجار .. سێ‌جار .. لەدەمی هاتەدەر گورێکی دایە خۆی جارێکی دی دووبارە بەپەلـــە ئەو مارە درێژەی لە قورقوراگە دەرکرد چەنـــد بەیفێکی دی پێوە لکانەوە لە پێشـەوە لە دواوە کە وستەکە دوا پرۆڤەی بوو .

بێ‌دەنگی بالی بەسەریاندا کێشا وێنـــەکەی زیاتر سەرنجی راکێشا زیاتر بەرەو ناو کۆلانەکـــە گلۆربوونەوە ؟! تەنها وەك گەریدەیەك ســـــەیری دەکردو سەرنجی دەدا ئەویش بێ‌دەنگی زیاتـــــر پالپشـــتی بوو کـــە لـــە جـــاران زیاتر ســــوور هەلگەرابوو .

پاش ئەوەی لە دادتووەکە رەت بوون ... بە دەنگێکی هێدی :

— « نازانم بلێم چی !

بەلام ئەو وەك گەریدەیەك تەنها ســــەرنجی دەدا .

ئەمجا رووی قسـەکەی گۆری

— « هەموو مرۆڤێك خاوەن گۆرانــــە . لەبەر ئەوە لەوانەیە بیروباوەرمت بگۆرێیت » .

ئەمجا ئەو کەوتە ئاخاڤتن :

— « بەلام مەسەلەی ... هەرواســـانا نی‌یە ... » .

زیاتر دەنگ گرتبوو لە جاران دەستێکی بە کەزی‌یە لوولەکەیدا هێنا :

— « ئەمرۆ لەگەلتە سبەینێ گوریسـێکی تر دەگرێ » .

— « هەموو یەکێك نابێت بەو پێوانەیـە بخەملێنی » .

ئەمە کۆمەلێك گفتوگۆبوو ساتێش یەك لـە دوای یەك دەرۆیی‌و گەرمای هاوینیش زیاتـــــر تەنگی پێ هەلچنیبوو . کات خۆی دەدا لە پانزەو نیوی نیوەرۆ .

**ئا ئێستا لەســـــــەر چەرپایەکەی کەوتووە دەیەوێت کۆتـایی بهێنێت بـــەلام نازانێت چـــۆن کۆتایی بنووسێت باوێشك دەدا نامەکەی تواناى نی‌یە لـــە نێو نامەکانی جوولـــە بکات ، نابێت بخەوێت دەبێت دوابەشی بنووسێت .**

دوادیاری شـــــانۆگەری « لـە چاوەروانی گۆدۆدا » بوو کە بۆینارد جارێك .. دووجـــــار خوێندیەوە . باسی دووان دەکات کـــە چاوەروانی ژوانی یەکێك دەکەن لەژێر دارێك ناوی گۆدۆیە .

— « ئا . دەبێت ئەز کامیـــانبم دەبێت چاورێ بکەم ... !؟ ئـــایا ئەو چـــاوەرێی چی دەکات . ئامادەم لە ژێر دارتووەکە ... چاوەرێی ئەو شتە دەکەم ئەمرۆ .. بەیانی تادەبگەمێ .

دوا ئاوەزی برست کرد :

ئـــا . بەیانی سبەینێ لەوانەیە دارتووەکـە لەگەل لێشاوی خانوو شۆستەکاندا خاپوور بێت ئەو کاتە چی دەکرێ ، چاوەروانی چی دەکـــەی ئایا ! ئەو چاورێ دەکات .

دواگوری دایە خۆی کە دیدەکانی خەوالـــو بووبوو ، چاویلکەکەی لەسـەر مێزەکەدانا :ـ

— « ئاگەر خاپوور بێت گەورەترین پەیکەر لەجێی دارتووەکە دروست دەکـــــەم ناوی دەنێم چاوەروانی ... ؟!

**شەو کاتێکی درەنگ بوو خۆی دەدا لـــــە پانزەو نیوی شـــــەو کــــە خەوێکی خۆشی بالی بەسەردا کێشا .**




کەڕووبارێک تێکەڵ بەدەریا ئەبێت
ئەوەندەی‌تر
شەپۆل دەهاوێژێتە کەنار
هیوای مرۆڤی مەزنیش
لەخوێن‌و دەمارەکانی‌یەوە هەڵدەڕژێت ..
لەناخی زەویدا شین ئەبێت ..

* * *

ڕەنگە کانیاوەکان
لەبناری تاشە بەردەکان بتۆرێن
وردە چەوی خاکەکەیان نەشۆنەوە
ڕەنگە بەفر ..
ملی لووتکە بەجێ‌بێڵێت
بەڵام هیوا
لەئاسۆی ژیانت ناتۆرێ

* * *

گەر چەپکێ خۆر
نەگانە گشت کەلەبەرێک
گەر شەپۆلی وەرزی باران
جێی هەندێک بیابان هەڵنەگرن
خۆری هیوای ... مرۆڤی گەورەیان دەگاتێ‌و
گوڵی زەرد لەیەخە دەدەن ..

* * *

● عەبدوڵڵا کەریم مەحمود ●

# پێم خۆشە ئەم بەهارێ ..



● هیدایەتی عبدوڵلا حەیران

سێ شەممە :

خۆت گۆڕیبوو ..
بێ‌دەنگ دیاربووی
وێنەی زستانێکی غەمنان
کراسێکی سپی بەفریت لەبەرابوو
کراس ، وەك نیگای شەرمنم
خۆی لەدەوری شانو ملو ..
مەمکەکانت ئاڵاندبوو ..

* * *

**چوار شەممە :**

**خۆت گۆڕیبوو ...**
**لەبەهارێ ڕووخۆش ئەچووی**
**کراسێکی ئاودامانی سەوز ... سەوز**
**وەك عەشقەکەم**
**خۆی ئەکردە سەرگەردانی هەموو بالآت .**

پێنج شەممە :

خۆت گۆڕیبوو
هاوین ئاسا
کراسێکی سووری ئاگراویت لەبەرداو
گڕ لەمەمانت هەڵئەسا

**هەینی :**

**خۆت گۆڕیبوو ...**
**کراسێکی تەنکی زەرد ..**
**چناری بەژنو باڵآتی داپۆشیبوو**
**لەگشت ڕۆژانی ژیانت ئاسایی تر**
**بێ‌ئارایشت ، جوانو ساکار**

هەر لەخوشکی پاییز ئەچووی ، بێ‌دەنگو مات
ئیمرۆکە چەندم خۆش ئەوێی
خۆزگە بمریت ، خۆزگە بمرم !!

**سلێمانی ٥-٥-١٩٨١**

---

**(١) ناوونیشـــانی شـیعرەکە نیوەدێرێکی ( نالی )یە .**

# گۆڤان



شیعری .. قاسم شێروانی

دڵەکەم نیگا بەفرو خوێن
پیرۆزەی نیگات
تیرۆشکی بەفرینی سپێرەیەکی بەهارییە
نێرگزە شیعریش دڵی هەڵوەدام ئاسا
خۆیان لەبەر سۆلافی پرشنگی نیگارت ڕادەخەن
خۆشم دەوێی
بەڵام نازانم بۆچی ویژدانی خەڵکی
دەبێتە هەورو ..
دەرگا لەڕێبوارو ئەستێرەی ئاواتم دادەخەن

* * * *

سەرم بەردەبازی ڕووباری خەمانە
دڵێشم کۆترە سپیلکەی سەر سواندانە
لەپەرچەمی زەردو خاوی تۆ بەولاوە
بستولکەیێ شکنابا بیکا بەهێلانە
دەمەی فڕینە گیانەکەم
مرۆڤێکم ڕێبواری ڕێگای ژیانم
قەستی هەواری عیشقی تۆم کردووە
خۆشم دەوێی بەدڵو گیانم

* * *

هۆ شۆخو شەنگە چیاییەکە
کە تۆ دەڕۆی
بەسەرکەفی دەریایەکی مەنگدا دەڕۆی
دڵە لاتو بێ نازەکەم
دەست لەڕیشمەی کەژاوەی کۆچت بەرنادا
چونکە گیانە .. لەدووریتا
فرمێسکیش دادی ئەو کۆستو خەمەم نادا
دەڕۆیو بەتاقی تەنیا
من لە ئافاری غوربەتا جێدەهێڵی
دەڕۆی .. دەڕۆی
دەڵێی هەتاوی لەئێوارەی عیشقی من ئاوادەبی
ئاخ کەنازانم لەدوای تۆ
ئەو گۆڤانەم بەروخساری کێسەودا دەبێ ..!!
دەڕۆیو
جارێکیش من لەگەڵ خۆت نابەی
وەڵا ئەو منالە بێنازەی
باوکی نایباتە سەفەرێ
بەدواتا دێمو دەگرییم

وەك ئەو خونچەیەی بەهار جێی دەهێڵێ
دەڕژێتەوە هەڵدەپروکێم
گەر کێژەنی زەردی خەزەڵوەرێ هەڵدەکا
بزانە بلبلی شەیدا
چ شیوەنو زیماری بۆ گوڵان دەکا(*)
دەوەرمەوە تازیەم تاوێ
وەك ڕێژنەیێ
گەر دەڵولی ئەو کوڤانەم دەمرکێنە
وەرەو سەوێ لەخۆشیانا بەکوڵ
تێر تێر بمگرێنە ..
ئەگەر دێمەو
شنەی بناری کێوەرەشێ لێمدەدا
وەك شۆڕەبی دەشنێمەوەو
وادەزانم دلی تۆیەو
بەلێنی خۆشەویستی‌یەکی هەتاهەتایەم پێدەدا

* * *

داخی گرانم کەتێم ناگەی !
گیانە خۆ تۆ
خونچەی نێو ئینجانەی ماڵە بڕژوا‌یان نی
ئاپەپولەی تاسەم بەداخی ماچێکت بسوتێنی
تۆ بە بۆنی بەفرو گیابەندو کانیاوان
پەروەردە بوی
کە من خوێنم خوناوی سەر بنەگەرو تەڕاشان بێ
چۆن دلت دێ
هەر بە ئەنقەست بەڕەنجێنی .. بەشەمزێنی

* * *

تاقە گوڵم
ئەگەر هەرتۆزێکیش تۆ منت خۆش بوێ
من دەپەرستم دوو چاوت
ئەگەر تۆ خەم خۆری نالەی تەنیاییم بی
پێم خۆش نی‌یە ئازادبم ... دەرچم لەداوت
دەبا هەروا سەرگەشتە بم
مەکۆی خەمان بێ دلی من
بەس نەزاکەتو هەنەپرۆکێ سوود گوڵی من

(*) کوڤان .. داخ .. حەسرەت
(*) زێمار ... لاواندنەوە .. سەردولکە

# ئایشۆکەخان

● رزگار عبدالله ●

« ئایشۆکێ .. وایشێ .. وایشێ
بۆم وەرە دەرکی حەوشێ »
گەر دەرگاکانیان لەڕوو داخستبێت
پەنجەرەکان لەڕووی خۆر بکەرەوەو گورانی بلێ
ئایشێ ... ئایشێ .. !!
دنیا تابلۆیەکی سەوزەو لەجوارچێوەیەکی زۆر رەنگایە

وا لەژوورە تاریکەکەت
بەرامبەری پەنجەرەکان .. هەلواسراوەو بەتەنیایە
ئایشۆکەخان !!
ئەوانەی وەك ئێمە بەژین
لە گۆرانی‌یەکانی تۆ ناگەن
ئەوانەی سەرما نەچێژن
لەئازاری گیانت ناگەن
ئەوانەی تۆیان خۆش ئەوێ
هەست بەبوونی خۆیان ناکەن
ئایشۆکەخان !!
پەنجەکانم بۆنی قژی تۆیان لێدێ
ها .. ناو لەپم بۆخۆت سەمای لەسەر بکە
ئەوەش سینگم خەمی هەموو دنیای تیایە
مەلەوانی تێدا بکە ..
ئایشۆکەخان !!
رووبار هەیە لەئاستتا رانەوەستێ
گەر ئارەزووی مەلەبکەیت !؟
مرۆڤ هەیە ڕ.زی چاوەکانت نەگرێ
گەر سەما لەناو لەپما بکەین !؟
ئایشۆکەخان !!
بەرزە بالایت
لق و پۆپی بالای بەرزم
جۆلەکەی جوانی بۆهێنایت
دنیا بەفرەو بەفریش بۆ ئێمە دەبارێ
ئایشۆکەخان !!
سینگم بەرگەی خەمی هەموو دنیا دەگرێ ،

# گەشتێك بەناو ئەستێرەدا

● سەردار فەتاح ئەمین ●

ئەگەر بمانەوێ بە چاوی ئەویندارێکی پاکی شیعرەوە بڕوانینە ئەم چەند پارچە شیعری ئەبووبەکر دەبێ خواستو نیازو ئاواتی دوێنێو ئەمڕۆی خۆمانو کۆمەڵەکەمانی بەئاشکرا ، تیا بەدی ئەکەین ، شاعیر توانیوێتی بە شێوەیەکی ساکاروبێ تەمومژ ، لەمەسەلەکانی دەوروپشتی خۆی قوڵ بێتەوەو ، جەوهەری بنەڕەتی ژیان بکاتە بەردی بناغەی بینای شیعرەکانی .. شاعیر لەبارەی « ناوەڕۆكو فۆرم »ی بەرهەمی ئەدەبی‌یەوە ئەو ڕاستی‌یە دێرینەی دووبارە کردۆتەوە کە « یەك تەواوکەری » یەکترین ، لەیەك دابڕ ناکرێن »[١] .. کەچی نازانم لە سەر چ بنچینەیەك شاعیر ، سەبارەت بە شیعرەکانی خۆی ، لەو ڕاستی‌یە پاشگەز بۆتەوە . ئەبێ ئەمە تەوازووعێك بێت لەلایەن شاعیروە بەرامبەر شیعرەکانی یان لە ناخەوەیە ، کە دەڵێ « بەڵام من ناوەڕۆك پێش دەخەم ، بەر لەئاڵو والای فۆڕم ... ل٥ » مەسەلەکە بەو جۆرەنی‌یە ، کە شاعیر تێ‌ی‌گەیشتووە ، چونکە شیعر ڕاپۆرتێکی ساکاری ڕۆژانەی ژیان نی‌یە . « چۆن پێویستە ، ڕێبازی ئەدەبی‌مان بە ڕێبازی ڕامیاری‌یەوە ببەستینەوە بەو جۆرەش پێویست ئەکات ، فۆڕمو ناوەڕۆك بەیەکەوە ببەستین »[٢].

★ شاعیر لە کۆتایی پێشەکی‌یەکەی‌دا ، وەك نیمچە پاڕانەوەیەك ، لەوە دەچێ باوەڕی بەخۆی نەبێت ، ڕوو دەکاتە خوێنەرو دەڵێ « جا تکام لە ئێوەی ئازیز ئەوەیە وەك بەرهەمی لاوێك لە هۆنراوەکانم بڕوانن ، ئەوەش بزانن کە تەمەنی شیعر نوسینم لە سێ ساڵ زیاتر تێ‌ناپەڕێ ... ل٥ » لێرەدا پرسیارێك ڕوو بە ڕووی شاعیر دەکەمەوە و لێ‌ی دەپرسم ، مادام تەمەنی شیعری هێندە کەمە ، بۆچی پەلەی لە بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی کرد ؟! .. هەرچەندە تەمەنی لاوی‌و پیری ناتوانێ ببێتە پەساپۆرتی شیعر ، باش یان خراپو بۆ خوێنەرانی دیاری‌بکات .

شاعیرێکی وەك ( ڕامبۆ )[٣] لە تەمەنی ( ١٦ ـ ١٩ ) ساڵی‌دا ، توانی خۆی بگەیەنێتە چلەپۆپەی شیعری فەرەنسی . کەچی تازە لای ئێمە ، بە بەرهەمە شیعری‌یەکانی خۆمان دەڵێین « تکایە وەك بەرهەمی لاوێك ، لە هۆنراوەکانم بڕوانن » ئەبێ هۆی چی‌بێ کە بەرهەمی لاو بەجۆرێکی تر لێ‌ی بڕوانن ، جگە لەوەی کە هۆی ئەم بڕوانەبوونە لە ئەنجامی کەم ئەزموونی‌و خۆڕۆشنبیر نەکردنەوەیە لە هەموو بوارەکانی ئەدەبو ژیاندا . « شاعیری ڕەسەنو قاڵبوو ، ئەوەی ئەینووسێ قەناعەتی پێ‌یەتی بۆیە ئەینووسێو خۆی‌و کۆمەڵەکەی ئەبێ لەناو دێڕەکانی‌دا بدۆزێتەوە » نەك لە کۆمەڵ بپارێتەوە ، چاوی لێ‌بپۆشنو وەك بەرهەمی لاوێك لە هۆنراوەکانی بڕوانن . لەکاتێکا کۆمەڵ ئەوەی لە لاوان چاوەڕوانی ئەکات ، لە کەسی ترەوە چاوەڕوانی ناکات .

★ هەرچۆنێ بێ ئەمە قەناعەتی شاعیر خۆیەتی ، بەڵام ئەگەر بێین لە شیعرەکانی بڕوانین لە چاو ئەوەی کە تەمەنی شیعری کەمە ، ئەبینین بەو جۆرە نی‌یە ، کە شاعیر گومانی لە خۆیەتی . لەگەڵ خوێندنەوەی دێڕەکاندا هەست بە شەپۆلێکی مۆسیقی خامۆش ئەکەین ، کە تێکەلاو بەخواستو ژانی مرۆڤە سەودا سەرەکان بووەو لەگەڵ دلە چیانشینی‌یەنەی خۆی‌دا بانگیان ئەکات .

هەروا چەند ووردە سەرنجێکی ترم دەربارەی لایەنی دەربڕین و بەکارهێنانی چەند ووشەیەك هەیە لە شیعرەکانی شاعیردا ، لەم خالانەی لای خوارەوەدا ڕوونی ئەکەمەوە :ـ

١ ـ شاعیر هەندێ جار پێشگری ( دە )ی فرمانی ڕانەبووردووی بەکارهێناوە هەندێ جاریش پێشگری ( ئە )(٤) ، وەکو « تێ هەلئەدەن ، وای لێ ئەکەن ، دەردەکەوێ سام دای دەگرێ » بڕوانە شیعری « باخی بوون » لاپەڕە « ١٠ » هەرچەندە تائێستا هیچ کام لەم دوو پێش گرە لە زمانەکەمان ساغ نەبۆتەوە ، کە کامیان بەکاربهێنرێ ، بەلام جێگەی خۆی بوو شاعیر یەکێك لەم دووپێشگرەی بەکاربهێنایە نەك هەردووکیان .

٢ ـ هەندێ جاری تر شاعیر پەیرەوی کێشی شیعرەکەی نەکردووە و لە کاتی خوێندنەوەیدا قورسییەك لەسەر زار دروست ئەبێت ، بەڕای من کێش مەرجێکی سەرەکی شیعرە ، شاعیر ئەلێ :ـ

**لەپێناو وەدەستهێنانی**
**یەك دوو ئانا هەزاران**
**بۆ چەوساوە ، بۆرەش و ڕووتی**
**« ئا ئەم جیهانە جەنجالە بەسەر بردێ »**
**[ ل ١٣ ]**

لەم دێڕەی دواییدا کێشی شیعرەکە ئالۆزاوە و شاعیر نەیتوانیوە بە وشەی زیادەی « ئا ئەم »یش پارسەنگەکەی بهێنێتەوە . هەروەها لەهەمان شیعردا ئەم ڕستە شیعرییە ناتەواو دێتەپێش چاو کە ئەلێ :ـ

**سێبەکانت لە ڕووی ئەم**
**زریانە شێتا کردبیەوە ..**
**[ ل ١٢ ]**

ڕاستی ئەم ڕستەیە بەم جۆرەیە ، هەرچەند کێشی شیعرەکە تێك ئەچێت ..

**سێبەکانت لە ڕووی ئەم**
**زریانە شێتەدا کردبێتەوە**

هەروەها لە لاپەڕە (١٩) دێڕی « ٤ » شاعیر ئەلێ :ـ

**« دوێ ئێوارە خەومەبینی »**

دیارە شاعیر لەبەر کێشی شیعرەکە ٠ وای لەم دێڕە کردووە ، ڕاستییەکەی بەم جۆرەیە « دوێنێ ئێوارە خەوم ئەبینی » دوابەدوای ئەم دێڕە بەردەوامەو ئەلێ :ـ

**هەرچی درەختی ڕووتەلەی**
**کەنار دلی سیروانی ئەم ویرانەبوو**

ڕاستتر بوو بیووتایە ..
« کەنار دلی سیروانی ئەم ویرانەیە بوو »
تا ئەگاتە ئەوەی ئەلێ :

**« تەوقی پشکۆی گڕی ڕقیان**
**لە گەردنیان ئەئالێنرا »**
**[ ل ١٩ ]**

شیاوتر بوو بیووتایە :

**« تەوقی پشکۆی گڕی ڕقیان**
**بەگەردندا ، ئەئالێنرا »**

ئەمە بوو سەرنجەکانم دەربارەی کۆمەلە شیعری « ئەستێرە » هیوادارم سوودێکم گەیاندبێ و لەکۆتاییدا پیرۆزبایی لە شاعیری لاو کاك ئەبووبەکر قەرەداغی ئەکەم ، چونکە چاوەڕوانی ئەوەی لێ ئەکرێ ببێتە شاعیرێکی باش ، ئەگەر زیاتر خۆی پێبگەیەنێ و بەشتی لاوەکی ترەوە نە گیرسێتەوە ...

●

**سەرچاوەو پەراوێزەکان :**

١ ـ هەمان سەرچاوە .
٢ ـ ڕۆژنامەی هاوکاری ، ژمارە ( ١١٩ )ی ١٩٧٢ ـ فؤاد میسری .
٣ ـ ڕۆژنامەی هاوکاری ، ژمارە ( ٤٩٤ ) ئازاد عبدالواحد .
٤ ـ ڕۆژنامەی هاوکاری ، ژمارە ( ٤١٨ ) ئازاد عبدالله .

# پەری عەشق

« عەبدولکەریم عەبدوللا »

ئەڵێن چەند ساڵێ لەمەوبەر
پەری عەشق خۆی بەزەوی‌و مرۆڤ ناساند
یەکپارچە نوورێکی ڕووت‌بوو
کە فەرهادی لەسەر ئەرزا بینیەوە
خۆی‌کرد بە شیرینی باڵای

* * *

ئەم شەو بوومە تەمێ چڕو
بە سوورایی باڵاتا خۆم ... هەڵئەسوام
تاڵ ... تاڵ ئەزیە بەهەشتیەکەتم ماچ کرد
دێوانە بووم .... بۆیە دڵم
بووە وولاتی ئارامی سۆزی باڵات
لەناو دڵی ئاسمانێکی دەنگاو ڕەنگا دێوانە بووم
ئاسمانی چی‌ی !!
پڕ بوو لە وورشەو زریکەی گوڵ ئەستێرە
لەخۆری جۆراو جۆرو جوان
سێ پەری بە سێ دەستەوە
شەوگاریان لەگەڵا بڕییم
پەری یەکەم : دەستی تۆ بوو
پەری دووەم : فریشتەی عەشق
پەری سێیەم : ئەو ووشانەی بەئاسمانی دڵت
چڕیان
کە ئەمبینی :
عەشقت کردووەتە ملوانکەیە زێڕین‌و
بەئاسمانی سینەو ملتا ... دێت‌و دەڕوا

ئەوەندەی تر عەشقی ساوات بەرین ئەبوو

* * *

کە زێی ڕەنگاو ڕەنگی هەتاو
سینەو مەمی ئاسمانی شەنگ ناڵەرزێنێ
تا باڵای شۆخی وەرزەکان .. یەك .. دوای .. یەك
ژانێ سوور مەچنی بەهار نەیان گرێ
شەنگە بێری گوێ نادێرێ
بۆ سەدای عەشقی ئەستێرە
تا تریفەی زیوی مانگەشەوی باڵات
بۆ رووی دەریای چاوەکانم ... سەما نەکاو
سەری نەخاتە سەر ڕانی
هێشوی ژانە سەختەکانم

* * *

لەژێر هۆیەی ئێوارەیەکی بەهارا
عەشقی سەوزو گەردن کەشت
بەئازارو ژانەکانم دەناسێنم
گوڵە پاییزەی ژانەکانت دەوەرێت‌و
لەبەر دەمیا سەما دەکا
ئەر هاتوو کۆتی زۆرداری دەستی بڕییم
ئەوا تاقە گوڵە سووری ... هەڵکێشن‌و
لەناو دڵی بێ ئۆقرەما ... بێنێژنەوە
تاکو هەموو سەری ساڵێ
گوڵی گەشی خوێنی عەشقتان
بۆ دەکەمە خۆرە ڕەنگینەکەی نەورۆز

# هەر جارەی نووسینێک

**با ئاوڕێ لەگەلی کوردمان لە ئێران بدەینەوە .. !**

---

هەموو زۆر چاك ئەوە دەزانین کە رژێمی شای ئێران چۆن نۆکەری ئەلقە لە گوێی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو زایۆنیزم بوو . چۆن بەوپەڕی دلسۆزی یەوە دژی بزوتنەوەی ئازادیخوازی ناوچەکەو دراوسێکانی بەتایبەتی دژی عیراقی شۆڕشی ١٧ – ٣٠ تەموزی مەزن پیلانەکانی ئەوانی رادەپەڕان .

هەروەهاش لەناوخۆی ئێراندا لە لایەکەوە بۆ قازانجی سەرمایەدارانی شارەکانو لە لایەکی تر بۆ پتەوکردنی دەرەبەگەکانو بۆ ئەوەی زیاتر دەرگای ولات بخاتە سەرپشت بۆ تالانو بردی ئیمپریالیزم گەلانی ئێرانی بێبەشی هەموو مافێکی نەتەوایەتیو کۆمەلایەتیو رۆشنبیریو سیاسی کردبوو بە ئارەزووی خۆی دەیچەوساندنەوەو دەیکوشتنو بەندو دەربەدەری دەکردنو باری ئابووری ولاتەکەی بەتەواوی شپرزە کردبوو .. هتد .

بەلام گەلانی ئێران بەرامبەر بەم رژێمە نالەبارە خوێناوی یەی شا دەستەئەژنۆ دانەنیشتنو توانیان یەكبگرنو ئەنجامی خەباتێکی سەختو خوێناوی ئەو رژێمەیان خست .

گەلی کوردیشمان کە یەکێك بوو لەو گەلە دلێرانەی ئێرانو بەدەیان راپەڕینو هەلوێستی مەزنی مێژوویی هەیە وەك گەلانی تری ئێرانو هێزە چاکەخوازەکان لە رژێمی تازەی دوای شا چاوەڕێی وەرگرتنی ئەو مافە رەوایانەی خۆیبوو کە قوربانی بۆ داوەو لە رێیدا هەزاران تالیو سوێری چەشتووە .

کەچی رژێمی تازەی ئێران لە جیاتی ئەوەی هێزە پێشکەوتوخوازو نوێنەرانی گەلانی ئێران بانگکاتو بۆ مەسەلەی مافی رەوای هەموو بوارێکی نەتەوایەتیو سیاسیو .. هتد راوێژیان پێبکات تا وەکو ئەم گەلو هێزانە لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوەو خزمەتی ولاتو رۆلەکانی ئێران بکات .. لە جیاتی ئەوەی لەگەل هاوسێکانیدا ئەو لەکەی دەستدرێژیو خوێنرشتنەو لەناوچەوان بە هاوسێکردنی باشو بە دۆستایەتیو برایەتی بسرێتەوەو بۆ ئەوەی مەترسی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم لەناوچەکە دووربخاتەوە هات وردەوردە کەوتە چەسپکردنی جێگای خۆیو دوورخستنەوەو لێدانی ئەم هێزە سیاسیو پێشکەوتنخوازانەو ئەم گەلانەی ئێرانو بۆ ئەوەشی کە دلسۆزی خۆی بەرامبەر بە ئیمپریالیزمو زایۆنیزم دەرخات شەڕی بە سەر عیراقی پێشکەوتنخوازو سەربەستماندا سەپان .

بەلام گەلی کوردمان لە ئێراندا سەری بە ئەم رژێمە ناپاكو خۆفرۆشە دانەوانو ئەوا پێ دەنێتە نەورۆزێکی نوێ کە هەزاران سالە ئاگری ئەم نەورۆزەی نەکوژاوەتەوە دەستی دایە چەكو رژێمی رزیوی ئێرانیش بە هەزارانیان لێدەکوژێو رەوانەی سێدارەو بەندیخانە دەکرێنو شارو دێهاتەکانیان وێراندەکرێنو دەسووتێنرێن .

ئەمرۆ لە عیراقی شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەموزی مەزندا گەلی کوردمان لە عیراقدا شانبەشانی برا عەرەبەکانی کە خاوەنی مافی خۆیەتیو دەتوانێ سەربەست بنووسێو رێی لێنەگیراوە ..

سا ئەی پێنووسە رەنگینە نەترسەکان ئەمەیە ژیانی گەلەکەتان لە ئێراندا .. راپەڕین پشتی ئەو تێکۆشانە چەکدارە نەتەوەیی یە بگرنو تاوانە رەشە پیسەکانی رژێمی ئێران دەرخەن کە بەرامبەر بە گەلی کوردمان لە ئێراندا دەیکات .. ئەمرۆ هەلەو ئەم هەلەش هەلێکی مێژوویی یەو لە دەستمان دەچێ چونکە دواڕۆژ نەتەوەکانی ئەم گەلە دەربارەی شۆڕشکەیانو مافی رەواو کوشتنو بڕینو ستەمکاری رژێمی ئێران بەرامبەر بە گەلی کوردمان لە ئێراندا دەپرسن .. باووباپیرانی کوردمان .. چییان نووسی ؟ یارمەتی چیان داوە ؟ بە شانۆ .. بەچیرۆك .. بەشیعر .. بە نووسین پشتیان چۆن گرتووە ؟

جا بۆ ئەوەی هەمیشە لە بەردەمی نەوەی دواڕۆژو نەتەوەو مێژوو راستیدا سەربەرزوو رووسوور بین دەبێ لەبەرهەمەکانمدا تەنانەت لە گفتوگۆ کردنو تابلۆو گۆرانیشماندا ئەو واقعە رەنگ بداتەوە کە گەلی کوردمان ئەمرۆ لە سایەی رژێمی نالەباری ئێرانەوە تیا دەژیو بە هەموو رەنگێ دەربڕی ئەو دەنگە دلێرەبێ کە دەرخەری تاوانەپیسەکانی ئەم رژێمەیە بەرامبەر بە گەلی کوردمان . تا ئەوکاتە ئەم رژێمە چەپەلەی ئێران دەکەوێو گەلی کوردمانو گەلانی تری ئێرانیش بە مافی خۆیان دەگەنو دەشبێ هەر بگەن !

■ مصلح جەلالی ■

لەپۆستەدا بەژمارە (١٤١) تۆمار کراوە

بەیان
مجلة ادبية شهرية
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

BAYAN

Litrary Monthly Magazine
Ministry of Culture and Information
Issued by: The Kurdish House for Culture and Publishing
Baghdad-Iraq

CHIEF IN EDITOR

MUSLEH MUSTAFA AL-JALALY

دار الحرية للطباعة - بغداد

نرخی ( ٢٠٠ ) فلسە